# پێوەر

## یان

## ڕووناکییەکانی ڕێگا

محمد فەتحوڵڵا گولەن



# پێوەر

یان

ڕووناکییەکانی

ڕێگا

نووسینی: محمد فەتحوللا گولەن

وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان

چاپی یەکەم: تەمموز ٢٠١٨

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردنی (٣٢٦)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێدراوە

تیراژ: ٣٠٠٠



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

+964 (0) 750 713 80 00

## بەشی یەکەم (حیکمەت)

## بەشی دووەم (مرۆڤ و ڕەفتارەکانی)

## بەشی سێهەم(ئەخلاقی کۆمەڵایەتی)

بەشی چوارەم (ڕوانگەی بزاوتن)

# دەربارەی گەشت بۆ جیهانەکانی ئەودیو

ئەی گەورەترین مەزن!

کاتێك لەو شت و ڕووداوانە ڕادەمێنین کە ئەوپەڕی گونجان و سازشیان لەنێواندایە و، تەماشای ئەو وێنە هەرە پرشنگدار و هەرە هاوسەنگانە دەکەین کە چاوەکان ئەبلەق و، سەرەکان تووشی سوورڕمان دەکەن و، لە سینەی ئەو سروشتەدا داتناوە کە کۆگای هونەرەکانی تۆیە و، کردووتە بە ناوێنەی هەزار و یەك ڕەنگی تەجەللیی جوانییە نهێنییەکانی خۆت و سەرنجڕاکێشترین و داهێنەرانەترین بەرهەمە هونەرییەکانی خۆتت تێدا داناوە کە لە جوانترین شکڵ و شێوەوە پێچاوتنەتەوە و، لەسەر ڕێگەکەماندا وەك پێشانگایەك خستووەتنە پێشچاو و، پاشان ئێمەشت بۆ بینینی بانگهێشتکردووە.. کاتێك لە دەنگی قەڵەمەکەتدا و لە ڕێکوپێکیی ئەو کتێبەدا کە بەو قەڵەمە نووسیوتە تۆ دەبینین و تۆ دەبیستین و هەست بە تۆ دەکەین و شاباڵدەگرین، چاومان دەچێتە سەر کانگای هەموو ئەو یاسا و ڕێسا و ڕێکوپێکییەی لەو کڵاوڕۆشنانەوە دەبینرێن کە لەژێر ڕووناکیی ناوەکانی تۆدا دەکرێنەوە و، گشت ئەو ڕەنگ و شێوانەی کە موشاهەدە دەکرێن و، تێکڕای ئەو دەنگ و نەغمانەی کە

دەبیستریێن و، پاشان سەرجەم ئەو کۆرس و سەمفۆنیایانەی کە لەم دەنگان پێکدێن؛ ئیدی چاوەکانمان بە نهێنیی ئەو جیهانە مەزنانە سەرمەست دەبن کە سەرچاوەی هەموو شتێکن...

بە تەماشاکردنی ئەو پەنجەرە جۆراوجۆرانەی کە لەڕووی چاوی دڵ و ئیمان کراونەتەوە، پرکێشیی ئەوەمان کرد لەشێوەی درەختێکدا موشاهەدەی ناسنامەی ئەسڵیی ئەو ناوکی "تووبای بەهەشت"ە بکەین کە لە دەروونماندایە.. وە خۆمان بۆ گەشتێکی زۆر دوور و، زۆر سەخت، بەڵام لەهەمان کاتدا زۆر بەتام بەرەو ئەودیو و، ئەودیوی ئەودیوەکان ئامادەکرد. لەمەشدا "بەیان"ەکەی تۆمان کرد بە ڕابەری ڕۆحمان و، لەژێر ڕۆشنایی پرشنگی ناو و سیفەتەکانی تۆدا و، بەهۆی چەند حەقیقەتێکی نوورینەوە کە بەرەو ئەبەدییەت درێژ دەبنەوە باڵمان گرت و، ڕژاینە سەر ڕێگەکان.

لە گەشتێکی مەزن و پیرۆزی لەم جۆرەدا کە لە "گوفتار"ەکەتدا باسکراوە و ڕێنای کێشراوە و، تەنانەت بچووکترین وردەکارییەکانیشی تۆمارکراون و، لە کۆتاییدا بەهۆی میعراجی پیرۆزترین بەندەوە سەرجەم دەرگاکانی بەتەواوەتی کراونەتەوە و، بەهۆی ئەمەشەوە هەلی ئەوە هاتە پێش کە هەموو پاڵەوانێکی بواری مەعریفەت لەڕێگەی عەرشییەکانی ناو دڵیەوە بەرەو ئەو جیهانانە بەرزببێتەوە. ئەگەر سنووری خۆمان بەزاندبێت و دەستمان بۆ قوڵفی دەرگا نهێنییەکان بردبێت، پەنا بۆ لێبووردەییت دەبەین و داواکارین بیدەیتە پاڵ نادانیی ئەو ڕۆحە کاڵ و کرچانەمان کە ئەدەب و ئەرکان نازانێت و، لێمان خۆشببیت.

ئەی ئەو بەدیهێنەرە مەزن و هەرەجوانەی کە نیعمەت بە بوون گەیاند و، چێژی ڕەهای هەبوونت بە هەناومان بەخشی! ئەوە تۆیت کە ئەم جیهانە مەزنانەت وەکو کتێبێك لەبەردەمماندا واڵاکردووە؛ ئەوە تۆیت نهێنییەکانی

ناویان دەدەیت بە گوێی ویژدانماندا، دیسان هەر تۆیت کە ویژدانمانت کردووە بە کەنارێك بۆ دەریای پڕ لە شەپۆلی نهێنییە لاهوتییەکان! ئەگەر تۆ نیعمەت بەدینەهێنایە، ئێمە ئەماندەتوانی ببین. ئەگەر ئەم گەردوونە سەرسووڕهێنەرانەت وەك کتێبێك لەبەردەمماندا واڵانەکردایە و، لەڕێگەی نێرراو و ناسێنەرە بەڕێزەکانی خۆتەوە بۆت ڕوون نەکردینایەتەوە، وەکو گرۆی نەفامان کە تۆ ناناسن و ناگەن بە قووڵاییەکانی ناخی خۆیان، بەپەرێشانی ئەم دونیایەمان جێدەهێشت. گەر لوتفت نەنواندایە و بەگوێرەی ئاست و پلە و باڵامان باسی خۆتت بۆ نەکردینایە و، ئەو یەکەمین تەسدیقەت لە ڕۆحماندا جێنەکردایەتەوە کە زانست و مەعریفەت دەکات بە زانست و مەعریفەتی ڕاستەقینە و، پەیوەندی نێوان جیهانی دەرەوە و ویژدانمان دەستەبەردەکات و، هەموو ئەو شتانە وەردەگرێت و ناڕاستەیان پێدەدات کە دەربارەی زاتی ئولوهییەت زانیومانە و دەیزانین. لەکوێوە ئەم شتانە و تۆمان دەناسی و، بە ڕێنگاکەت سەرسام دەبووین؟!

ئێمە بەندەی زنجیرلەملی بەردەرگاکەتین و، ئەو پرشنگانەش کە لە ویژدانماندا دەدرەوشێنەوە، نووری بوونی تۆن. ئێمە هەرچییەکمان هەبێت، بەخششی تۆیە. جارێکی دی ئەمە ڕادەگەیەنین و، بە دانانان بەوەدا کە بەندەگەلێکی وەهای بەردەرگاکەتین کە بە ئازادی ڕازینابین، دەمانەوێت عەهد و پەیمانمان تازەبکەینەوە.

ئەی سوڵتانی دڵ و ئەی ئەو زاتەی کە زیکر و فیکرت ئاسوودەیی بە ڕۆحەکان دەبەخشێت! لەپێناو گەیاندنی ئەو شتانەدا کە تۆ فێرت کردووین و بە گوێی ڕۆحماندا چپاندووتە بەوانەی کە دڵیان بەوێنەی دڵی ئێمە مردوو و دەریەدەرن. گاهـ چووینە ناو دۆڵایی شتان و ڕووداوەکانەوە و، گاهـ گەڕاینەوە

بۆ ناو دەروونی خۆمان و، هەوڵماندا لە هەموو ئەو شتانەدا کە ڕوودەدەن ئەو پەنجەرانەی کە بەڕووی بوونی تۆدا دەکرێنەوە و، ئەو ڕێگایانەی بۆ حزووری تۆ بەرزدەبنەوە دەستنیشانبکەین. کاتێك ویستمان ئەو ڕۆژی بەختەوەریە بدەین بە گوێی موحتاجاندا کە تێیدا زاتی ئولوهییەت و بەبێ هیچ پەردە و ڕێگرێك تۆ دەبینین، نەمانتوانی وابەستەی ئەو حەقیقەتە هەرەمەزنانە بین کە دەربڕینە هەرە پاك و بێگەردەکان وێنە و نەخشیان دەکێشن. لەپێناو باسکردنی شتانێك بۆ هەندێك ڕۆحی کاڵ و کرچ کە لە قاوغدا ماونەتەوە و، دڵیان بە جوانییە ڕووکەشەکانی ئەم دونیایە داوە، دیوارە پیرۆزەکانی موجەرڕەدمان هێنایە لەرزە و، ستایشمان بە باڵای "دیاریکراو"(مشخص) و ماددەدا گوت. ڕەنگە لەبەرئەوەی نەمانتوانی ئاشکراترین حەقیقەتەکان هاوڕێ لەگەڵ پاکی و ڕوونیی ئەسڵی خۆیاندا پێشکەشبکەین، تاوانمان ئەنجامدابێت و، خزمەتی هەوا و ئارەزووی خۆمان کردبێت...

گەر هەڵەمان کردبێت، لە ڕێگای هاتن بەرەو تۆ و، لە کاتی هەوڵدان بۆ پیشاندانی ڕێگا بەوانی دیکە کردوومانە. سەرەڕای هەموو ناتەواوی و کەموکورتییەکانمان هەر لەسەر ڕێی تۆ بووین، هەڵە هەمیشە هەڵە و، کەموکورتیش هەردەم کەموکورتییە. هاوڕێ لەگەڵ مووچڕکەی ناو دڵمان و، چەماوەیی قەدی ڕۆحمان و، زنجیری ملماندا، بە هەزار و یەك گیان چاوەڕێی ئەو بڕیارەین کە دەریدەکەیت. کاتێك ئەمەش دڵنیین دەزانین کە ڕەحمەتە بێسنوورەکەت هەمیشە لەپێش غەزەبتەوە بووە، بێگومان کەموکورتی و ناتەواوی سەبارەت بەو بەندانەت کە شعووریان بە لوتفت کردووە شتێکی جوان و شایستە نییە؛ بەڵام تکایە ڕێگەمان بدە بڵێین کە لێخۆشبوون زۆر لە تۆ جوانە و لێت دێت!

بەڵێ، سوڵتانم "سوڵتان سوڵتانی و، گەداش گەدایی لێدێت!"

هەنووکە ئەگەر لێمان ببوریت، حەقیقەتی گەشتکردن بەرەو جیهانەکانی ئەودیو لە تایبەتترین جێگەی دڵماندا بەپارێزراوی هەڵدەگرین و، دەمانەوێت لاپەڕەکانی کتێبی گەردوونەکەت هەڵبدەینەوە و، هاوڕێ لەگەڵ نییەتی گەشتێکی نوێدا خۆمان لەنێو موتاڵای دوورودرێژ بهاوین و، گوێ بۆ ئەو دەڵاڵانە هەڵبخەین کە باسی تۆ دەکەن و، بە نەغمەکانی تایبەت بە تۆ لەهۆشی خۆمان بچین. دەسا ئەو موحتاج و دەربەدەرانە بپارێزە کە دەیانەوێت بە "بەزم"ی تۆ بگەن و، بە لوتفی ویساڵیشت دڵشادیان بکە!..

# دەربارەی ڕێبوار

مرۆڤ گەشتیارێکە و، گەردونیش پێشانگایەکی ڕەنگاوڕەنگ و کتێبێکی زەنگین و ڕەنگینی وەهایە کە بۆ موتاڵاکردن خراوەتە بەردەستی. ڕێبوار بۆ ئەوەی ئەم کتێبانە بخوێنێتەوە و، عیرفانی خۆی پتر بکات و، بەرەو مرۆڤێتیی ڕاستەقینە بەرزببێتەوە نێرراوەتە ئەم دونیایە. ئەم گەشتە ڕەنگاوڕەنگ و بەچێژە تەنها یەك جار بە نسیبی مرۆڤ دەبێت.. واهەستدەکەم ئەم گەشتە تاقانەیە سەبارەت بە کەسانێك کە هەستەکانیان هۆشیارە و دڵیان بێدارە، سەرووزیادی بەدەستهێنانی باخەکانی نیرەمی بەهەشتە. وەلی ئەوانەی بە چاوی نووقاوەوە دەژین، وەك ئەوەی هەناسەیەك ژیابن، چۆن هاتوون ئاواش دەڕۆن.

کەسێك کە بەقووڵی لە یاساکانی سروشت و ژیان ڕادەمێنێت و هەڵیاندەسەنگێنێت، هەر لە ڕەنگی بریقەداری گوڵەکانەوە هەتا گەڵای لەریوی درەختەکان و، لە زەنگی ترسێنەری هەورەبروسکەکانەوە تا نەغمەی ساز و دروستی باڵندە و بێچووەکانیان، لە هەمور شتێکدا جیلوەکانی جوانییەکی هەتاهەتایی دەبینێت و، لە گشت دەنگێکدا هەست بە تەقدیسکرانی قودرەتێکی

ڕەها دەکات و، لە ڕووداو و یاساکانی وەك ڕووناکی و جووڵە و هێزی ڕاکێشان و پەیوەندیی کیمیایی و شێوازی "دانەبەر"(سوق) و ئیدارەکرانیاندا، شوێنەوار و نیشانەی تەجەللییە خواییەکان دەبینێت.

کاتێك ڕۆح لە ژاوەژاوی ئەم جیهانە ماددییە و دەغدەغەی کەشوهەواکەی دووردەکەوێتەوە و بە قووڵاییەکانی جیهانی وەحدەتدا ڕۆدەچێت، بەدەم تەماشاکردنی تەجەللییە سەرسوورهێنەرەکانی بەدیهێنەری مەزنەوە لە گەردووندا لەهۆشی خۆی دەچێت. سەبارەت بە کەسانێك کە تا ئەم ئەندازەیە لە هەستەکانیاندا بە ویساڵی ئیلاهی گەیشتوون و، خۆیان ڕادەستی هەڵچوون و داچوونی شەپۆلەکانی وەجد و ئیستیغراقێکی ناکۆتا کردووە، کوڵان و وەلوەلەی قووڵایی بنکی زەریاکان و، دیمەنی جوانی گۆشە چەپەك و دوورەدەستەکان و، وەستانی بەریقاری لوتکەی ئەو چیایانەی کە پێشبڕکێ لەگەڵ هەورەکاندا دەکەن و، ئەو سێبەرە بزۆکانەی کە ئێواران لە بنارە سەوزەکاندا یاری دەکەن و، ئەو باخچە ئەفسووناوییانەی کە بەسەر ڕووی زەویدا درێژبوونەتەوە و، ئەو بۆنە جۆراوجۆرانەی کە چواردەوریان مەست دەکەن و، ئەو گوڵانەی کە لەگەڵ شەماڵ یاری دەکەن و، ئەو شەونمانەی کە لەسەر تەختی گوڵان دانیشتوون و چاو لە دەوروبەریان دادەگرن.. بەڵێ، هەموو ئەمانە گەر ئیشکدانەوەی جوانییە بێسنوورەکەی ئەو نەبن کە جادوو لە مرۆڤ دەکات، دەبێت چی بن؟!

زانران یان نەزانرانی ماهییەتی ئەو لای ئێمە چ مانایەکی هەیە؛ لە کاتێکدا کە هەموو دەنگێك ئەغمەیەکە لای ئەوەوە دێت و، هەموو شتێکیش نامەیەکە لای ئەوەوە ڕەوانەکراوە؟! دادوەر و شاعیری ئەڵمانی "گۆتە" دەڵێت "ئێمە هەم لە ڕۆحی خۆماندا و هەم لە سروشتدا هەست بە بوونی خوا

دەکەین. ئیدی نەزانینی ناوەڕۆکی و ماهییەتەکەی چ گرنگییەکی هەیە؟ بەڵێ، چی دەزانین لەسەر ماهییەتی ئولوهییەت؟ بیر و بۆچوونە سنووردار و تەسکەکانی ئێمە دەربارەی خوا چ مانایەکیان هەیە؟ ئەگەر هاوڕێ لەگەڵ سەدان ناو و چەندەها سیفەتیشدا یادی بکەمەوە، دیسانیش لە حەقیقەتەوە زۆر دوور دەبم. مادەم بەدیهێنەری مەزن نەک تەنها لە مرۆڤدا، بەڵکو لە هەموو ڕووداوێکی گەورە و بچووکی جیهاندا و، لە سینەی دەوڵەمەند و بەتوانای سروشتدا بە هەموو شێوەیەک تەجەللی دەکات، کەواتە ئایا ئەو فیکر و بۆچوونەی کە لەسەر ئاستی پێوەرە مرۆییەکان دەربارەی ئەو زاتە کامڵە بەدەستی دەهێنین دەتوانێت وەک پێویست و دەوروبەر بێت؟!" بەمەش ئاماژەی بۆ ئەو مەوجودە مەجهولە دەکرد کە بەهۆی ئاسەوارەکانیەوە خۆی دەردەخات و لە ژیانی دونیادا زاتەکەی نابینرێت.

ئێمەش لەپێناو ئەو زاتەدا کە لە چاوان پەنهانە و دەیەوێت لەڕێگەی سنعەتەکانیەوە خۆی بە ئێمە بناسێنێت، بیر لە ڕێ و ڕێبواری دەکەینەوە و، دەمانەوێت هەمیشە لە ڕێگای بەرەو ئەودا بین و، بە کردنەوەی بەردەوامی ئەو دەرگایانەی بەرووی ئەودا دەڕوانن، ڕێگایەکی ناکۆتامان هەڵبژاردووە. خۆ ئەگەر جیهانیش بوەستێت، ئێمە بێگومان بە وتنی سرود و گۆرانییەکانی تایبەت بە ئەو، دونیا لە ولوولە پڕدەکەین... جا چۆن وا نەبێت، لە کاتێکدا کە ئێمە و هەموو شتێکی دیش لەبەر خاتری ناسین و ناساندنی ئەو لێرەین و، ئەرکێکی دیکەی لەمە مەزنتریش پێنازانین. ئێمە هەموومان سێبەری بوونی ئەوین و، ئەویش کانگا و سەرچاوەی هەموو شتێکە.

ئەوە "ئەو"ە کە ئاو لە ناخی زەوییەوە هەڵدەقوڵێنێت و لە بەخشندەیی و سەخاوەتمەندیی خۆیەوە کانییەکان دەتەقێنێت، کەمەری ڕووناکی لە ملی

خۆر دەکات و تاجی گەرمی دەنێتە سەرا خاك بە گوڵانی ڕەنگاوڕەنگ ئارایشت دەدات و لە یەك کاتدا هەزار و یەك پۆشاك لەبەری زەوی دەکات. هەورەکان بە چاوی دەریاکان سەیری "ئەو" دەکەن و، دەریاکانیش بە زمانی هەورەکان یادی "ئەو" دەکەنەوە. هەر "ئەو"ە کە هەناوی خاکی لە هەزار و یەك ئازار و ژان پڕکردووە و، جگەری مەرجانی تێزاوی خوێن کردووە. خۆرەکان کۆیلەی بەردەرگای ئەو و، دونیاکانیش بەندەی زنجیرلەملی ئەون.

ئەی بەدیهێنەری مەزن! تێکڕای موڵك و سەڵتەنەتی جیهان لەژێر ئاڵاکەی تۆدا سەر بۆ تۆ ئەوی دەکەن و، سوڵتانەکان لە دەرگانەی تۆدا کۆیلایەتی هەڵدەبژێرن! هەموو شتێك بەرەو تۆ ڕادەکات و، سواڵی "بوون" لە تۆ دەکات؛ بەڵام تۆ لە خۆتەوە هەیت! بوونەوەرە کاتییەکان دێنە بوون و شکڵ و شێوە وەردەگرن و پاشان دەکوژێنەوە و دەڕۆن؛ بەڵام تۆ لە هەموو ئەم شتانە پاك و بێگەردیت! تاکیت. بێوێنەیت. پێویستت بە هیچ نییە! هەموو بوونەوەران هانا بۆ لای "یەکتایی" تۆ دەبەن. یەکتایی تۆ کەوسەر و بەهەشتی ئەوانەیە کە لە بیاباندا بەجێماون. ئەم شوێنانە بە فەرمانی تۆ لە جێگەی خۆیاندان. گومەزی ئاسمان بەهێزی قودرەت و ئیرادەی تۆوە ڕێکوپێکیی خۆی دەپارێزێت. ئەگەر هەموو ئەمانە پشتیان بە تۆ نەبەستایە، پەیوەندیی نێوان ئەستێرەکان دەشێوا و بەرنەی دانەکانی تەزبیحێك بە هەناوی گەردووندا پەرش و بڵاو دەبوون و، کەسیش نەیدەتوانی ڕێکریان لێ بکات.

ئێمە هەموومان بەهێزی تۆوە بە بەختەوەری گەیشتین. بە ناسینی تۆ بەختەوەریی ڕاستەقینەمان ناسی. لە بەختەوەرییەك هەڵدێین کە پشتی بە تۆ نەبەستووە و لای تۆوە نایەت و، ئەفرەت لە بەختیارییەکیش دەکەین کە تۆمان بیربباتەوە. بەڵێ، پێویستە بەرامبەر بە هەر شتێك کە باسی تۆ ناکات بێدەنگ

ببین و لێی زویربین و، هەر شتێکیش تۆمان یادنەخاتەوە فەرامۆشی بکەین.

ئەی بەدیهێنەری مەزن و خاوەنی ڕەحمەتی ڕەها! ئێمە وەك کۆیلەکانی بەردەرگاکەت و، وەك بەندەگەلێکی ڕاستگۆی وەها کە ئامادەین لەم پێناوەدا دەست لە دونیا و عوقبا هەلبگرین، هەتا ئەمڕۆ سوجدەمان بۆ کەسێکی تری جگە لە تۆ نەبردووە و بەندایەتیمان بۆ کەسی تر نەکردووە. خەمەکانمان لای کەسی تر هەلنەڕشتووە. ئەگەر درکاندبێتیشمان، هەزار و یەك تەوبەمان کردووە و بۆ لای دەرگاکەت گەڕاوینەتەوە. خوایە تۆ پیاڵەی ئەمانەی کە لە دەرگاکەت دوورناکەونەوە لە خۆشەویستیی خۆت پڕبکە و، خەندە بخە سەر ڕوخساری ئەوانەی کە چەندین سەدەیە ڕوویان بزەی بەخۆوە نەدیوە.

ئەی ئومێد و ئاسوودەیی ماتەمباران! ئەی خاوەنی ئامۆ و غەریبان! ئەی چارەی بێچارەکان! پەردەیەك لەڕووی بەندە ناچارەکانتدا والابکە؛ برسێتییان مەهێڵە و زامەکانیان تیماربکە! ئێمە ویستمان لەڕێگەی وتنە و شکڵ و شێوەکانەوە باسی تۆ بۆ کەسانی دیکەش بکەین و بەمەش ئەو جوانییانەیان بۆ بگوازینەوە کە لە ویژدانماندا هەستی پێدەکەین... ئەگەر بەهۆی ئەمەوە ئەو حەقیقەتە مەزنانەمان پێشێلکردبێت کە نایانزانین، داوای لێبووردن و لێخۆشبوونت لێدەکەین.

# دەربارەی زانست

دوورکەوتنەوە لە زانستە ئەرێنی و ئەزموونییەکان لە ترسی ئەوەی لەوانەیە مرۆڤ بەرەو ئیلحاد ببەن، کارێکی منداڵانەیە و، ئەژمارکردنی زانستەکانیش وەك ئەوەی شتانێکی تەواو پێچەوانەی دین و ئیمان و هۆکاری ئیلحاد و کوفر بن، بڕیارێکی پێشینە و نەزانییە.

***

زانستەکان بەئەندازەی گەرمتیکردنی بەختەوەریمان و بەرزکردنەوەمان بۆ مرۆڤێتیی ڕاستەقینە بەسوودن. بەپێچەوانەوە، ئەو زانست و تەکنەلۆجیایەی کە مرۆڤ دووچاری کابوس دەکات، جادووگەرێکی شەڕەنگێز و شەیتانێکی وەهایە کە سەری ڕێگەی لێگرتووین.

***

لەبەرامبەر ئەوەدا کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا هەندێك ماددەپەرستی بێرتەسك زانستیان کرد بە خوا و هەموو شتێکیان بە قوربانی کرد، زانایەکی ئەو سەدەیە کە لەسەر ئاستی هەموو جیهان ناسراوە، وتی "زانستی بێ دین کوێرە و، دینی بێ زانستیش شەلە". بەم وتەیەش بە نیانترین شێوە توانجی لەو وڕێنە و شێتییە ترسناکە دەگرت کە سەدەیەکیان تەنیبووەوە. نازانم داخۆ ئەگەر کوێر و شەلەکانی ئەم سەردەمەی بدیبا چی دەوت؟!

***

بانگەشەکردن بۆ ئەوەی زانستە ئەزموونییەکان هیچ شتێك نین

نەزانی و دەمارگیرییە و، ڕەتکردنەوەی هەموو شتێکیش لە دەرەوەی نەوان کۆنەپەرستییەکی بیرتەسکانەیە؛ بەڵام تێگەیشتن و قبووڵکردنی نەوەی کە مرۆڤ لەژێر ڕۆشنایی هەر زانیارییەکی نوێدا، چەندەها شتی دیکەی نەزانراو دێنە پێشی، نیشانەی زیهنێکی زانستی و ڕاستڕەوییە لە بیرکردنەوەدا.

***

زانست و تەکنەلۆجیا لە خزمەتی مرۆڤدایە و، هیچ هۆکارێکی جددیش بۆ ترسان لێی لەگۆڕێدا نییە. مەترسی لە زانستیبوون و بنیاتنانی دونیا بەشێوەیەکی زانستی نییە، بەڵکو مەترسی لە نەزانی و بێشعووری و خۆدزینەوەدایە لە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی.

## ئامانجی چاوەڕوانکراو لە زانست

لەبەرئەوەی ژیانی ڕاستەقینەی ئادەمیزاد تەنها بەهۆی زانست و عیرفانەوە بەدەستدێت، ئەوانەی فێربوون و فێرکردن فەرامۆشدەکەن گەر زیندووش بن هەر بە مردوو ئەژماردەکرێن. چونکە گرنگترین ئامانجی بەدیهاتنی مرۆڤ بینین و زانین و گەیاندنی ئەو شتانەیە بە کەسانی تر کە فێریان بووە.

***

بیرکردنەوە و بڕیاری هەر کەسێک بەئەندازەی پەیوەندیی بیرکردنەوە و بڕیارەکەی بە عەقڵ و لۆجیکەوە سەرکەوتووە. عەقڵ و لۆجیکیش لەگەڵ زانست و مەعریفەتدا ڕاستەوانە دەگۆڕێت. لەبەرئەمەیە کە هەر جێگایەک

زانست و مەعریفەتی تێدا نەبێت، عەقڵ لەکارکەوتوو و، لۆجیك فریودەر و بڕیارەکانیش نادروستن.



مرۆڤێتیی هەرکەسێك بە فێربوون و فێرکردن و ڕۆشنکردنەوەی کەسانی دی دیار و دەردەکەوێت. کەسێك کە نازانێت و لەهەمان کاتیشدا بیر لە فێربوون ناکاتەوە، بەو شتانەش کە فێریان دەبێت خۆی نوێناکاتەوە و نابێت بە نموونە بۆ کەسانی تر، ئەگەر بەڕواڵەت لە مرۆڤیش بچێت، کەسێتیی ناوەوەی جێگەی گومانە!



ئەو شتانەی فێریان دەبین و فێری کەسانی تریان دەکەین، پێویستە بەئاراستەی هەڵماڵینی نهێنییەکانی ماهییەتی مرۆڤ و گەردووندا بێت. ئەو زانستەی تیشك ناخاتە سەر نهێنییەکانی ناو مرۆڤ و، خاڵە تاریك و تەنگ و تەسکەکانی بوون ڕۆشن ناکاتەوە، زانست نییە.



ئەو پلەوپایەیەی کە لەڕێگەی زانست و مەعریفەتەوە بەدەستدەهێنرێت، لەو پلەوپێگانە بەرزتر و تەمەندرێژترە کە لە ڕێگەکانی ترەوە دەستدەکەون. چونکە زانست لەم دونیادا خاوەنەکەی دەکاتە دارای فەزیلەت و لە خراپەکان دووری دەخاتەوە و، لەو دونیاشدا بە ئیمان و عیرفانەکەی بەجۆرێك بەختەوەری دەکات کە لەسەرروو وێناکردنەوەیە.



هەموو دایك و باوكێك پێش ئەوەی مێشکی منداڵەکانیان بە شتانی

ناپێویست پڕبکرێت، پێویستە بە زانست و عیرفان تێریان بکەن. چونکە ئەو دڵانەی خاڵین لە حەقیقەت و ئەو ڕۆحانەی مەحرومن لە مەعریفەت، وەکو کێڵگەیەکی گونجاو وان بۆ نەشونماکردنی هەموو جۆرە بیرۆکەیەکی خراپ. سەرەتا هەر تۆوێکیان تێدا بچێنرێت، لە کۆتاییشدا هەر ئەوە دروێنە دەکرێت.

***

مەبەست و ئامانج لە فێربوونی زانست بریتییە لەوەی کە زانیاری ببێت بە ڕابەر و چاوساغی ئادەمیزاد و، شتانی فێرکراو ڕێگاکانی گەیشتن بە کەماڵاتە مرۆییەکان ڕووناکبکەنەوە. بەرمەبنای ئەمە، ئەو زانستانەی لە ڕۆحدا ئەچەسپێن، بارن بەسەر خاوەنەکەیانەوە؛ ئەو مەعریفەتەش مرۆڤ بەرەو ئامانجە باڵاکان ئاڕاستە ناکات، حەماڵێتییە لەسەر ئاستی دڵ و بیر.

"زانست زانینی زانستە

زانست خۆناسینە

گەر تۆ خۆت نەناسیت

ئەمە کەی زانینە"[1]

زانستێك کە ئامانج و مەبەستەکەی دیاریکراوە، سەبارەت بە خاوەنەکەی، هۆکارێکی بەرەکەتی هەتاهەتایی و گەنجینەیەکی نەبڕاوەیە. ئەوانەی خاوەنی ئەم گەنجینەیەن، بەدرێژایی ژیانیان، تەنانەت دواتریش، وەکو کانییەکی شیرین و سازگار هەمیشە سەردانەکرێن و دەبنە مایەی خێر. گریمانە و بیردۆزە بەتاڵەکانیش کە ئامانجیان دیاری نەکراوە و، گومان و دوودڵی لە سینەکان دەهاوێن و، ڕۆحەکان دووچاری تاریکی دەکەن، زیلکایەکن بۆ کۆبوونەوەی ڕۆحە ئائومێد و لێڵەکان، یان تەڵەیەکن بۆ ڕۆحەکان.

١. (یونس ئەمرە).



هەرچەندە زانست و هونەر هاوڕێ لەگەڵ لق و پەلە جۆراوجۆرەکانیان و ئەو سوودانەش کە هەریەکێك لەم پەلانە هەڵیانگرتوون سوودبەخشن بۆ زۆربەی زۆری مرۆڤەکان، بەڵام چونکە تەمەنی مرۆڤ و توانا و هەلومەرجەکانی سنووردارن، مەحاڵە هەموویان فێربێت و سوودیان لێوەربگرێت. لەم ڕووەوە پێویستە هەموو تاکێك ئەو شتانە فێربێت کە پێویستن بۆ خۆی و میللەتەکەی و، تەمەنی خۆی لە شتانی بێهوودەدا بەفیڕۆنەدات.



لەبەرئەوەی زانای ڕاستەقینە هەمیشە لەژێر ڕۆشنایی ڕاسترین هەواڵەکان و، دروسترین گوتارەکان و، ئەزموونە زانستییەکاندا بەردەوامی بە هەوڵ و لێکۆڵینەوەکانی خۆی دەدات، هەمیشە دڵی ئاسوودەیە و کارەکانیشی ئاسان دەبن. هەندێك ڕۆحی داماویش کە لە سەرچاوەی ڕاستەقینەی زانست بێبەشن، چونکە بەبەردەوامی ڕێ و ناڕاستە دەگۆڕن و هەرچەند دەکەن لە خەیاڵی خاو ڕزگاریان نابێت، هەمیشە لەنێو خولگەی بێهیواییدا دەناڵێنن و دەتلێنەوە.



نرخ و بەهای هەرکەسێك بە ئەندازەی ناوەڕۆك و دەوڵەمەندیی ئەو زانستەیە کە بەدەستی هێناوە. ئەو کەسەی زانست تەنها لەپێناو "قسە و قسەلۆك"دا بەکاردەهێنێت، نرخەکەشی هەر ئەوەندەیە، ئەوەش کە لە ناسینی شتان و ڕووداوەکاندا وەکو "ئاوێنە"یەك بەکاری دەهێنێت و، بە باڵی عیرفان بە تاریکترین گۆشەکانی شوێن دەگات و، بەوەش بە ڕاستییەکانی ئەودیو "سروشت"دا دەکات، نرخ و بەهای ئەمەندەیە...

# زانست و نەزانی

ئەگەر هێنان و ڕیزکردن و جوینەوەی زانستەکان و دارشتنەوەیان لەشێوەی کتێبدا لەو ڕووەوە بەسوودبێت کە شتانی زانراوی ئێستا جارێکی دی موتالآدەکرێتەوە، لەو ڕوانگەیەوە کە ڕۆحی ئیلهام و هەڵێنجان ئیفلیج دەکەن، دەکرێت بوترێت کە هەزار و یەك زیانی هەیە.

***

زانست ڕابەرێکی گرنگی هێدایەتە.. بەتایبەت ئەگەر پاڵ بە وەحیەوە بدات و لەوەوە خۆراك وەربگرێت.. لەم ڕووەوە ئەو دەگات بە ڕەهەندگەلێك کە سنوورەکانی زەوی و ئاسمان تێدەپەڕێنێت و بەهایەکی جیاواز وەردەگرێت.

***

لە ئێستادا کەسی داهێنەر و دۆزەرەوە پێناگات، بەڵکو کەسانی چاولێکەر و لاسایکەرەوە هەڵدەکەوێن. پێویستمان بە ڕۆحێکی یاخیی وەهایە کە بەشێوەیەکی گوزەیی گۆڕانکاری لە هەموو شتێکدا بکات. هەموو شتێك دەگۆڕێت. کتێب و قوتابخانە و دەرگا و ڕەحلە و هەموو شتێك.. وە دەستپێکردن بە ڕەخنە بەردی بناغەیە.

***

نەزانی خراپترین هاوڕێ و زانستیش وەفادارترین دۆستە.

***

کاتێك عیلم لەگەڵ حیلم یەکدەگرێت، دەگات بە ترووپکی سەرسووڕهێنەر.

***

نەزان کاتێك تووڕەدەبێت دەکەوێتە هاتوهاوار، بەڵام عاقڵ نەخشەی ئەو شتانە دادەڕێژێت کە پێویستە بکرێن.

***

فەزیلەت، لەسەر سێپای عیلم و حیلم و پەرستش دەوەستێت.

***

ئەگەر زانست نەبووبێت بە سەرچاوەی کردار، مەحکومی وشکبوونە.

***

پێویستی، دەلالی چارتیژی دۆزینەوە زانستییەکانە.

***

تێگەیشتن جیایە و زانین جیایە، تێگەیشتن لە شتێك باشترە لە زانینی هەزار شت!

***

خۆت لەسەر وتنی "نازانم" ڕابهێنە، بۆ ئەوەی هەرگیز دووچاری شەرمی وتنی "نازانم" نەبیت!

***

هەروەك چۆن پێشبڕکێی جۆراوجۆر دەکرێت، گەر پێشبڕکێی نەبوونی و هەژارییەکانیش بکرایە، بێگومان نەزانی تاجی پادشایی وەردەگرت.

# ڕێزگرتن لە بیر و بۆچوون

ڕەخنەگرتن لە هەموو شتێك و بیانووگرتن لە هەموو شتێك هەڵەتی کاولکارییە. ئەگەر مرۆڤ شتێکی بەدڵ نەبێت، پێویستە هەوڵی باشترەکەی بدات. چونکە ڕووخاندن وێرانە و، بنیاتنانیش ئاوەدانی لێ چێدەبێت.

***

پێویستە مرۆڤ زیاتر لە دوژمنایەتی نهێنی و ڕقی ژێربەژێر بترسێت، وەك لە تووڕەیی و توندوتیژیی ئاشکرا. دۆستان ئەگەر ڕووبەڕوو ڕەق و توندوتیژیش بن، لە پاشەملە هەمیشە وەك فریشتەی پارێزەر ڕەفتاردەکەن. بەڵام دوژمنان لە نەرمونیانیدا تەڵە دەنێنەوە؛ تووڕەیی و ڕقیشیان لەو کاتەدا بەدەردەخەن کە بەرتەنەی جاڵجاڵۆکە نێچیرەکەیان خستووە داوەوە.

***

دەڵێن "فلانە کەس هەست بە شتی ناو هەوا دەکات"! قوربانی کەسی وەهابم! ئەی دەبێت چی بەوانە بوترێت کە لەژێر بارانیشدا تەڕ نابن؟![1] لە کۆڕ و دانیشتنەکاندا ڕێز لە هەموو وتەیەك بگرە! تەنانەت ئەو بیرۆکانەش یەکسەر ڕەتمەکەرەوە کە لەگەڵ بۆچوون و بیرکردنەوەی تۆدا ناگونجێن. بیر لەوە بکەرەوە کە لەوانەیە خاوەنەکەی مەبەستێکی دیکەی هەبووبێت، بۆیە تا کۆتایی ئارامگرە و گوێبگرە!

---

١. کورد، وەکو ئاماژەیەك بۆ وریای و زیرەکی دەڵێت "فلانە کەس کاغەزی سپی دەخوێنێتەوە". لێرەدا دەمانتوانی ئەم پەندە کوردییە لەبری پەندە تورکییەکە دابنێین. بەڵام لەبەر خاتری پاراستنی ڕەگەزدۆزیی ئەوان شێلیاران وەکو خۆی وەرمانگێڕا.

***

ئەزموون، مامۆستای عەقڵ و ڕابەری بیرکردنەوەیە.

# دین

لەو ڕۆژەوەی ئادەمیزاد هەیە هەتا ئێستا، مرۆڤ ئارامی و ئاسوودەیی ڕاستەقینەی لە هەرێمی گەرموگوڕی دیندا دیوەتەوە و تەنها لە سایەی دیندا توانیویەتی بەختەوەر بێت. لە جێگایەکدا کە دینی تێدا نییە هەروەک ناکرێت باس لە ڕەوشتی بەرز و فەزیلەت بکرێت، بەهەمان جۆر ناوهێنانی بەختەوەری و کامەرانیش هەتابڵێیت سەختە. چونکە سەرچاوەی ئەخلاق و فەزیلەت ویژدانە. تاکە شتێکیش کە حوکمی ویژدان دەکات، ئەو دینەیە کە بریتییە لە پەیوەندیی بە خوای گەورەوە.

***

دین، بە پیت و بەرەکەتترین قوتابخانەیەکە لەبەر خاتری خوو و ڕەوشتە جوان و باشەکان کراوەتەوە. قوتابییەکانی ئەم خوێندنگا مەزن و باڵایەش هەموو مرۆڤەکانن بە گەورە و بچووکیانەوە. هەرکەسێک خۆی وابەستەی ئەم خوێندگایە بکات، زوو یان درەنگ، بە ئارامی و ئاسوودەیی و ئاسایش و دڵنیایی دەگات. بەڵام ئەوانەی کە لە دەرەوەی دەمێننەوە، بەتێپەڕبوونی کات هەموو شتێکیان، تەنانەت خود و ناوەرۆکی خۆشیان دەدۆڕێنن.

***

دین، تێکڕای ئەو پرەنسیپە خواییانەیە کە مرۆڤەکان هاوڕێ لەگەڵ ئیرادەی ئازادی خۆیاندا بەرەو خێرەکان ئاڕاستەدەکات. هەمیشە دەگونجێت لە دەستوور و یاساکانی دیندا پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی مرۆڤ و، ئەو بناغانەی کە سەرجەم بەختەوەرییە دونیایی و دواڕۆژییەکانی ئامادەدەکەن، بدۆزرێتەوە.

***

دین، بریتییە لە ناونیشانی ناسینی خوا و یەکتاییەکەی و، گەیشتن بە پاکژیی ڕۆح بە هەنگاونان لە ڕێگاکەیدا و، ڕێکخستنی پەیوەندییەکان لەگەڵ کەسانی تردا بەشێوەیەک کە ئەو ڕەزامەندیی لەسەر بێت و بەئاڕاستەی فەرمانی ئەو بێت و، تەنانەت هەستکردنە بە پەیوەندی و خۆشەویستییەکی قووڵ بەرامبەر بە هەموو بوون لەبەر خاتری ئەو و لەپێناوی ئەودا.

***

ئەوانەی دین قبووڵناکەن، بەتێپەڕینی کات دەستدەکەن بە بێڕێزیکردن بەرامبەر بە چەمکە بالاکانی وەک ناموس و نیشتمان و میللەت و هاوشێوەکانیان.

***

هەموو جۆرەکانی بێڕەوشتی چڵپاوێکی وەهایە کە لە سەرچاوەی بێدینییەوە هەڵدەقوڵێت، هەموو جۆرە تازەوە و ناشووبێکیش بریتین لە زەڵکاوە ناشرینەکانی دۆڵی بێدینی.

***

هەندێك لەو بێباوەڕانەی کە ژیانیان بۆ دژایەتیکردنی دین تەرخانکردووە، هیچ نەبێت نەدەبوو تا ئێستا هەندێك لە سوود و میوە و بەروبومەکانی بێدینیمان پیشانبدەن؟

***

دین و زانستی ڕاستەقینە وەك دوو ڕووی یەك حەقیقەت وەهان. دین، مرۆڤ بە ڕێگا باشەکاندا دەگێڕێت و بە ئەنجامگەلێکی وای دەگەیەنێت کە بەختەوەری دەکەن. ئەو زانستەش کە ئامانج و مەبەستی دیاریکراوە، بەوێنەی مەشخەڵێك، لەم ڕێگایانەدا و لە بواری خۆیدا بەردەمی مرۆڤ ڕووناکدەکاتەوە.

***

تێکڕای گوڵە جوانەکان لە باخچەی دیندا پێگەیشتوون. ئەوە دەستوور و یاساکانی و، ئەوەش پێغەمبەران و ئەولیا و ئەصفیاکان کە میوەی قەشەنگ و درەوشاوەی ئەو باخچەیەن..! ئەگەر بێباوەڕان چاو لە ئاستی ئەم میوانەشدا بنووقێنن، هێشتا ناتوانن لەنێو لاپەڕەی پەڕتووکەکان و سینەی مرۆڤەکاندا بیانسڕنەوە.

***

پێغەمبەران لەناو مرۆڤەکاندا وەکو چیا وەهان. هەروەك چۆن شاخەکان ماکی ئارامی و سەلامەتین بەوەی کە زەوی جێگیردەکەن و هەوا پاکژدەکەنەوە، پێغەمبەرانیش لەناو مرۆڤایەتیدا هەمان ڕۆڵ دەبینن. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە ناوبەناو هەردووکیان پێکەوە باسکراون. بەڵێ، لە نوح و جودی و، موسا و طور و، موحەممەد و حیرا، هەریەکەیان هێمایەکن کە پەردە لەسەر ئەم نهێنی و تەلیسمە لادەدەن.



دین، لەسەر بیری ساغ و، ژیریی تەندروست و زانست ڕاگیربووە. لەم ڕوانگەیەوە هیچ یەکێك لە بابەتەکانی ڕەخنەیان ناڕاستەناکرێت. ئەوانەی کە نایانەوێت بیناسن، یان سیستەمی بیرکردنەوەیان شێواوە، یان تێگەیشتنیان بۆ زانست هەڵەیە، یاخود داوەریی ژیرییان کەموکورتە.



دین، سەرچاوەیەکی بەپیتی وەهایە کە دەستوورەکانی شارستانیتیی ڕاستەقینە لەخۆدەگرێت. لە سایەی ئەودا ئادەمیزاد لەسەر ئاستی دونیای دڵ و هەستەکانی بەرزدەبێتەوە و، سەری دەگات بە جیهانەکانی ئەودیو فیزیك و، دەگات بە ئاسۆیەك کە تێیدا بە کامی دڵی خۆی لە کانیاوی سەرەکیی سەرجەم خێر و جوانی و فەزیلەتەکان دەخواتەوە.



ئەگەر کەسێك بەشوێن فەزیلەتدا وێڵبوو، پێویستە لە دیندا بۆی بگەڕێت. ئەوەی کە بێدین خاوەنی فەزیلەت بێت و دینداری ڕاستەقینەش بێبەش بێت لە فەزیلەت، یەکێکە لەو ڕووداوانەی کە بەدەگمەن دەبینرێت.



لە سایەی دیندا مرۆڤ پەی بە مانای مرۆڤێتی دەبات و لە زیندەوەرانی دی جیادەبێتەوە. لە دیدی بێدیندا مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵانی تردا جیاوازییەکی نییە.



دین، ڕێگای خوایە و، بێدینیش ڕێگای شەیتانە. لەبەر ئەم هۆکارە،

دژایەتیی نێوان دین و بێدینی هەروەك لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە هەتا ئێستا بەردەوام بووە، بەهەمان شێوە هەتا قیامەتیش بەردەوام دەبێت.

# قورئان

قورئان، گۆی ئەو یاسا خوایی و ئەو کاملترین پەیامانەیە کە بە ئەندازەی نرخ و بەهای مرۆڤ، لە بەرزترین بەرزاییەکانەوە دابەزیوە و لە ئاسۆی مرۆڤایەتیدا هەڵهاتووە و، ڕەچاوی دڵ و ڕۆح و عەقڵ و جەستەی کردووە.

***

ئەو قورئانەی کە لەمڕۆدا نزیکەی ملیارێك شوێنکەوتووی هەیە، هاوڕێ لەگەڵ دەستووره خواییە ئەبەدی و نەگۆڕەکانیدا، تاکە کتێبێکی بێوێنە و ئاوازەی وەهایە کە نزیکترین و ڕووناکترین ڕێگای گەیشتن بە بەختەوەری هەموو مرۆڤایەتی نیشاندەدات.

***

قورئان، سەرچاوەی ڕووناکیی شکۆدارترین و نوورانیترین کۆمەڵەیەکە کە تا ئێستا حوکمی تەدەری گۆی زەوی کردووە، کۆمەڵەیەك کە ملیۆنان زانا و، هەزاران فەیلەسوف و بیرمەندی لەناودایە. لەم ڕوانگەیەوە هیچ دەسەڵاتێك ناگاتەوە بە فەرمانڕەوایی ئەو.

***

لەو ڕۆژەوەی قورئان نازڵبووە، ڕووبەڕووی چەندین رەخنە و بەرهەڵستی

بووشەوە، بەڵام لە هەموو ئەو دادگایانەدا کە بۆ ئەم مەبەستە دامەزراون، قورئان بڕوانامەی بێتاوانی وەرگرتووە و، سەرجەم پێکدادانەکانیش بە سەرکەوتنی ئەو کۆتاییهاتوون.



قورئان نوورێکی بلوورییە لە دڵاندا و، کانیاوێکی تیشکبەخشی وەهایە کە ڕۆحەکان ڕۆشندەکاتەوە و، سەرتاپای پێشانگای حەقیقەتەکانە. تەنها ئەو ڕۆحە باوەڕدارانە دەتوانن ڕووی ڕاستەقینەی بناسن و لێی تێبگەن کە لە گوڵێکدا هەست بە گشت جوانییەکانی گەردوون و، لە دڵۆپێکدا تەماشای تۆفانەکان دەکەن.



قورئان خاوەنی شێوازێکی وەهایە کە کاتێك ڕەوانبێژەکانی عەرەب و عەجەم ئایەتەکانی ئەویان بیست سوجدەیان برد و، ئەو ئەدیبە حەقیقەتناسانەش کە هەستیان بە جوانیی ناوەڕۆکەکەی کرد و لێی تێگەیشتن، بەئەدەبەوە لەبەردەم ئەو "سوڵتانی وتە"یەدا سەریان دانەواند و چەمینەوە.



موسڵمانان تەنها لەڕێگەی تەسدیقکردنی قورئان و باوەڕهێنان پێی لەناو خۆیاندا گەیشتوون بە یەکێتی و یەکڕیزی و، لە ئێستاشدا تەنها بەهۆی تەسدیقکردنی ئەو و باوەڕهێنان بە ئەو بە یەکێتی دەگەن. ئەوانەی تەسدیقی قورئان ناکەن هەرووەك بە موسڵمان ئەژمارناکرێن، بەهەمان جۆر مەحاڵە یەکێتی و یەکڕیزییەکی جێگیر لەناو خۆیاندا بەدەستبهێنن.



کاتێك دەوترێت "ئیمان بابەتێکی ویژدانییە"، مەبەست لەوەیە کە "با بە ویژدان تەسدیقی خوا و پێغەمبەر و قورئان بکەن نەك تەنها بە زمان". هەموو جۆرەکانی پەرستش کە وابەستەی ئەم تێگەیشتنەن، دەرکەوتەیەکی پێویست و حەتمیی ئەم تەسدیقە بەهێز و پتەوەیە.



لە سەردەمێکدا کە مرۆڤایەتی لەنێو وەحشەتی نەزانی و و کوفردا دەتلایەوە، قورئان وەك تۆفانێکی ڕووناکی دەرکەوت و بە یەك هەڵمەت جیهانەکانی نوقمی نوور کرد.. ئەم ئاڵوگۆڕ و گۆڕانکارییە هەرە مەزنە کە مێژوو ناتوانێت نموونەیەکی هاوشێوەیمان پیشانبدات، تەنها جارێك ڕوویداوە و ئەویش قورئان هێناویەتەدی. مێژووش وەکو گەواهیدەر سەرووزیادە!



ئەوە قورئانە کە لە دووتوێی هەستیارترین هاوسەنگیدا مرۆڤ فێری مانا و ماهییەتی مرۆڤ و، حەق و، حیکمەت و، زات و سیفەت و ناوەکانی خوای گەورە دەکات.. وە ئەستەمە لەم بوارەدا هاوشانی ئەو کتێبێکی دووهەم نیشانبدرێت. ئەگەر سەیری حیکمەتی ئەصفیا و فەلسەفەی فەیلەسوفە حەقپەرستەکان بکەیت، تۆش لەمە تێدەگەیت!



تاقە کتێبێك کە فەرمان بە دادپەروەری و ئازادیی ڕاستەقینە و خێر و ناموس و فەزیلەت و بەزەییهاتنەوە تەنانەت بە ئاژەڵانیشدا دەکات و، بەئاشکرا ستەم و شیرك و ناحەقی و نەزانی و بەرتیل و سوو و درۆ و شایەتیی درۆ قەدەغەدەکات قورئانە.

***

ئەو كتێبەش كە مافی هەژار و ستەملێكراوان دەپارێزێت و، پادشا و كۆیلە و، سەركردە و سەرباز و، داواكار و داوالێكراو لەسەر هەمان كورسی دادەنیشێنێت و دادگاییان دەكات، دیسان تەنها قورئانە.

***

نیشاندانی قورئان وەكو سەرچاوەی ئەفسانە و خورافیات، جگە لە هەندێك ورێنەی بێ بنەما كە لە عەرەبە نەزانەكانی چواردە سەدە لەمەوپێشەوە بۆ یێدینەكانی ئەمرۆ بە میرات ماوەتەوە، هیچی دی نییە. حیكمەت و فەلسەفەی ڕاستەقینە گاڵتە بە وەها تێگەیشتنێك دەكات...

***

ئەوانەی كە قسە بە قورئان و ئەو شتانە دەڵێن كە ئەو هێناویەتی، ئەدەبوو ئەگەر بەشێوەیەكی كاتیش بێت شتێك دەربارەی ڕێسا و ئارامی و ئاسایش و سەلامەتیی ئادەمیزاد بڵێن؟ ڕاستییەكەی كاتێك شارستانییەتە ئامۆزگان بە قورئان پەرێشان و دەربەدەرن و، دڵانی مەحروم لە تیشكی ئەو لەنێو ئازەحمەتی و پەژارە و قەیراندا دەناڵێنن، تێگەیشتن لەم باخیبوون و سەرسەختییە شتێكی زۆر سەختە...

***

ڕێكوپێكترین زیان بۆ مرۆڤایەتی ئەو ژیانەیە كە تێیدا نەسیبی قورئان هەڵدەمژێت. بەجۆرێك، زۆر بەئاسانی دەتوانین بڵێین هەندێك لەو جوانییانەی شارستانێتی كە ئێستا لە هەموو لایەكی دونیادا بە ستایشەوە چەپڵەیان بۆ لێدەدرێت، بەڵەوارەی ئەو شتانەن كە قورئان چەندین سەدە لەمەوپێش خەڵكی بۆ لایان هاندارە، كەواتە تاوان و كەموكورتی هی كێیە..؟!



ئەوانەی کە لای ئێمە لە دێر زەمانەوە دژایەتی قورئان دەکەن و شتانی ناڕاستی دەخەنە پاڵ و خۆخەریککردنیان پێیەوە کردووە بە پیشەی سەرەکیی خۆیان، بەگشتی ئەو نەزانانە بوون کە تەنانەت نەیانزانیوە کە نازانن. بەداخەوە ئەم داماوانە نە لێکۆڵینەوەیەکیان لەو قورئانە کردووە کە دژایەتی دەکەن و نە شتێکیان لەبارەیەوە خوێندووەتەوە. لەڕاستیدا لەنێوان بانگەشەی ئەمان و لافی ئەو نەزانانەدا کە پشتیان لە زانستە ئەزموونی و ئەرێنییەکان کردووە جیاوازییەکی ئەوتۆ بوونی نییە. بەڵام بۆ ئەوەی خەڵکی چاویان بەڕووی ڕاستییەکاندا بکرێتەوە، پێویستەکات ماوەیەکی دیکەش چاوەڕوانی بکرێت.



ئەوەی باوەڕ بە قورئان بهێنێت، مانای وایە ئیمانی بە حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هێناوە، ئەوەش کە ئیمانی بە حەزرەتی موحەممەد (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) هێناوە باوەڕ بە بوونی خوای گەورەش دەکات. ئەو کەسەی باوەڕ بە قورئان نەکات، مانای وایە باوەڕ بە پێغەمبەرێتیی حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) ناکات، ئەوەش باوەڕ بە حەزرەتی موحەممەد نەکات، بە باوەڕدار بە خوای گەورە نەژمارناکرێت. ئەمەیە ڕەهەندەکانی موسڵمانێتیی ڕاستەقینە..!



مرۆڤ لە سایەی قورئاندا گەیشتووە بە بەرزترین پلەوپایەکانی چەشنی دروستکراویی لەلایەن خوای گەورەوە. کەسێک کە شعووری پێگەیەکی لەم جۆرە دەکات، لەو قورئانەدا کە لەسەر زاریەتی گوێ لە پەروەردگاری خۆی

دەگرێت و، لەگەڵی دەدوێت و، ئەگەر سوێندیش بخوات کە لەگەڵی دواوە، لە سوێندەکەیدا بە درۆزن دانانرێت.

***

مرۆڤ لە هەرێمی ڕۆشنی قورئاندا، کاتێك هێشتا لە دونیادایە. بەناو گۆڕ و بەرزەخدا تێدەپەڕێت؛ مەحشەر و سیرات دەبینێت؛ لەتاو ترساکیی دۆزەخ تەزوو بە گیانیدا دێت و بەنێو بنارە ئاسوودەبەخشەکانی بەهەشتدا گەشت دەکات.

***

ئەوانەی موسڵمانانیان لە تێگەیشتن لە قورئان و قووڵبوونەوە تێیدا بێبەشکرد. لە ئەنجامدا لە ڕۆحی دین و کرۆکی ئیسلامیش دووریان خستەوە.

***

پێم وایە لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا و هاوڕێ لەگەڵ نیگای ئرخانئن و سەرسامی و بەگەورەزانیندا، ڕووبارەکانی زانست و هونەر و تەکنەلۆجیا کە بەرەو زەریای قورئان دەکشێن. کاتێك ڕژانە سەرچاوەی بنەڕەتی خۆیانەوە و ئارێتەی بوون. زانایان و لێکۆڵەران و هونەرمەندانیش جارێکی دی خۆیان لەنێو شەپۆلەکانی ئەو دەریایەدا دەبیننەوە...

***

ڕۆژگاری داهاتوو هی قورئانە، ئەمەش نابێت بە زۆر تەماشابکرێت! چونکە قورئان گوفتاری زاتێکی وەهایە کە دوێنێ و ئەمرۆ و سبەینێ پێکەوە دەبینێت و دەزانێت!

# حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

مرۆڤایەتی لەسایەی حەزرەتی موحەممەددا شارستانێتیی ڕاستەقینەی ناسی. لەدوای ئەو، هەموو ئەو هەولانەی بەم ئاڕاستەیەدا دراون جگە لە لاساییکردنەوە و ئەنجامدانی هەندێك گۆڕانکاری لەو دەستوورانەدا کە ئەو هێناونی هیچی دیکە نین. لەم ڕووەوە وا گونجاوترە ئەو بە "دامەزرێنەری شارستانێتیی ڕاستەقینە" ناوزەدبکرێت.

***

ئەو زاتەی ڕووی بە تەمبەڵ و تەمبەڵی نەداوە و، کارکردنی بە پەرستش ئەژمارکردووە و، چەپڵەی ستایشی بۆ کارکەر و هەوڵدەر لێداوە و، ئەودیوی ئەو چەرخەی پێشانی شرنکەوتووانی داوە کە تێیدا ژیاون و، ئاسۆی بوون بە لایەنێکی هاوسەنگی لەنێو تێکڕای مرۆڤایەتیدا نیشانداون، حەزرەتی موحەممەدە (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ).

***

حەزرەتی موحەممەد (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ)، لە دەرکەوتنیدا وەك شمشێرێکی پاڵەوان و ڕەوانبێژ لە دژی کوفر و وەحشەت و، ڕاگەیاندنی زابەڵەی حەقیقەت لە هەموو لایەکدا و، نیشاندانی ڕێگاکانی بوونی ڕاستەقینە بە مرۆڤایەتی، زاتێکە هاوتا و وێنەی نییە.

***

ئەگەر کەسێك هەبێت لە سەرزەویدا کە نەزانی و کوفر و وەحشەت

خۆشیان ئەوێنێ، بێگومان ئەوە حەزرەتی موحەممەدە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ). ئەو دڵانەی بەشوێن حەقیقەتدا عەودالن و تینووی عیرفانن، زوو یان درەنگ بەدوایدا دەگەڕێن و دەیدۆزنەوە و جارێکی دی لە شوێنپێی ئەو لانادەن.

***

ئەو زاتەی لە چوارچێوەی هاوسەنگییەکی زۆر ورد و دەراسادا تەبلیغی مرۆڤایەتی کردووە کە هەموو هەوڵێك لەپێناو پاراستنی دین و ناموس و نیشتمان و میللەتدا جیهادە و، جیهادیش پلەیەکی ئێجگار بەرزی بەندایەتییە. حەزرەتی موحەممەدە (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامْ).

***

ئەو کەسەی بۆ یەکەم جار بانگەوازی ئازادیی ڕاستەقینەی بەگوێی مرۆڤایەتیدا دا و، لە ویژدانەکانی گەیاند کە مرۆڤەکان لەڕووی ماف و دادپەروەرییەوە یەکسانن و، لە ئەخلاق و فەزیلەت و تەقوادا بەدوای بەرزی و مەزنێتیدا گەڕا و، هاوارکردنی حەقیقەتی لەبەرامبەر ستەمکار و بیری ستەمکارانەوە بە پەرستش هەژماردەکرد، حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بوو.

***

ئەو کەسەی پەردەی سەر فەنابوون و مردنی دڕاند و، گۆڕی وەك هۆڵی چاوەڕوانیی کراوە بەڕووی بەختەوەریی هەمیشەییدا نیشاندا و، ئەوانەی لە هەموو جێیەکدا بەدوای بەختەوەریدا ڕێلبوون گەیاندن بە چەشمەی خضر و، جامی ئیکسیری جاویدانی دانەدەست، حەزرەتی موحەممەدە (عَلَيْهِ أَفْ صَلَاةٍ وَسَلَامْ)

# تەسەووف

فەلسەفە و حیکمەت ئاسۆی بیرکردنەوەی مرۆڤ فراواندەکەن و، لە ناسینی شتان و ڕووداوەکاندا یارمەتی دەدەن، هەرچی تەسەوفیشە، لە ڕەهەندێکی سەروو ئیدراکدا، بەرکەوتنی نێوان مرۆڤ و بەدیهێنەری شتان و ڕووداوەکان دەستەبەردەکات و، دەیکات بە دۆست و هاودەمی خوای گەورە.



تەسەووف، وەکو لای ئەهلی تەریقەتیش دەبینرێت، بریتییە لە ڕووناکبوونەوەی ڕۆحی مرۆڤ لەڕێگەی زیکر و فیکر و، وەرگرتنی فەیز لە کەماڵاتە خواییە بێسنوورەکان. سەرەتاکەی بەوە دەستپێدەکات کە منێتیی مرۆڤ دەکرێت بە یەکەیەکی پێوانە و بەهۆیەوە هەندێک هێڵ و سنووری گوزەری و وەهمی بۆ ناکۆتایی دادەنرێت، کۆتاییەکەشی بریتییە لە دەستشتن لە منێتی و نهێنییەکانی منێتی و، قبووڵکردنی ئەو ڕاستییەی کە هەموو شتێک لە ئەوەوەیە.



تەسەووف، بریتییە لە ڕێگای لێکۆڵینەوە لەو ڕاستیی ئولوهییەتەی کە فەلسەفە دەستی پێی ناگات بەهۆی دەستی دڵ و قاچی دڵ و چاوی دڵەوە. لەم ڕێیەدا کە عەقڵ بە خۆی و سەری قۆتین و پێی خاوسەوە تەختی زەوی دەکرێت. دڵ وەک هەڵۆیەک لە شەقەی باڵ دەدات و، لەڕێگەی پێوەرە قەدرشناسەکانی خۆیەوە هەوڵدەدات ئەو مەوجودە مەجهوله بناسێت.

پاشان ئەو عیرفانەی بەدەستی هێناوە لەرێگەی وتنی (ما عرفناك حق معرفتك)ەوە ڕادەگەیەنێت.

***

تەسەووف ڕۆحی ئیسلامە. ناکرێت بەبێ ئەو بیر لە ئیسلام بکرێتەوە. هەرچی تەریقەتەکانیشە ئەمەیان سیستەماتیزە کردووە.

# کلتوور

کلتوور، سەرچاوەیەکی گرنگی وەهایە کە هەر میللەتێك لە پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی تایبەتیی خۆیدا زوو زوو سەری لێدەدات. لەنێوان تەندروستی و ڕاسترەویی ژیانی میللەت و پاکژیی سەرچاوەکانی کلتووردا هەمیشە پەیوەندییەکی نزیك و توندوتۆڵ بوونی هەبووە.

***

کلتوور، بریتییە لە کۆی هەندێك لەو بناغانەی کە لە زمان و پەروەردە و دابونەریت و هونەری کۆمەڵگەیەکەوە سەرچاوەی گرتووە و، پاشان بە دووبارەبوونەوەی بەردەوام وەك شێوازی ژیانی ئەو کۆمەڵگایەی لێهاتووە. چاوداخستن لە ئاستی ئەم بناغانەدا کوێرییە و، هەوڵدانیش بۆ دوورخستنەوەی کۆمەڵگا لێیان، کۆمەڵگا بەبێ ڕێگا و شێواز و ناڕاستە دەهێڵێتەوە و، سەرسام و سەرگەردانی دەکات.

***

کلتوور، لە ئەنجامی بەریەککەوتنی کەم تا زۆری میللەتان لەگەڵ

یەکتردا، تا ئەندازەیەك بەوێنەی شارستانێتی، دەکرێت لە کۆمەڵگەیەوە بۆ دانەیەکی تر بگوازرێتەوە. بەڵام ئەگەر لەم گواستنەوەیەدا پاڵێوگەکانی ڕژمی میللی بەباشی کارنەکەن و، پاڵاوتن و تەتەڵەی پێویست ئەنجامنەدرێت، لە ئەنجامدا قەیرانی کلتوور و شارستانی شتێکی حەتمی دەبێت.



کلتووری ڕاستەقینە بە کوڵانی بەردەوام لە مەنجەڵی دینی ڕاستەقینە و، ئەخلاقی بەرز و، فەزیلەت و زانستە هەرسکراوەکاندا پێدەگات و کامڵدەبێت. لە کەشێکدا کە بێدینی و بێڕەوشتی و نەزانی باڵادەستە، نە دەکرێت تێیدا باس لە بوونی کلتووری ڕاستەقینە بکرێت، نە ئەو کەسانەش کە لەم کەشەدا پێدەگەن هەلی ئەوەیان هەیە سوود لەم سەرچاوەیە وەربگرن.



ئەو کۆمەڵگایانەی گوایە لەگەڵ کلتوور و شارستانێتیی میللەتانی تردا دەچنە کەژاوەی هاوسەرگیرییەوە و، لەهەمان کاتدا هەوڵدەدەن بەردەوامی بە بوون و مانەوەی خۆیان بدەن. وەکو ئەو درەختانە وان کە میوەی درەختانی دی لە لق و پەلیانەوە ئاڵاوە، هەم کۆمیدین و هەم فریودەرن.



کلتوور، لە سروشتی میللەت و کۆمەڵگادا لەدایکدەبێت و گەشەدەکات. گوڵ و میوەکانی درەخت چی بن بۆ درەختەکە، کلتووریش هەمان شتە بۆ کۆمەڵگا. ئەو نەتەوانەی نەیانتوانیوە کلتووری خۆیان کامڵبکەن یان لەدەستیانداوە لەو درەختانە دەچن کە نەیانتوانیوە میوە بگرن یان میوەکانیان وەریون. ئەگەر ئەمڕۆش نەمێنێت بێگومان سبەی دەبڕرێنەوە و وەك پارچە تەختەیەکی مردوو بەکاردەهێنرێنە



کلتوور" لە ژیانی هەموو میللەتێکدا پێگەیەکی زۆر گرنگی هەیە. کلتوور"ێك کە ئاوێنەی ڕابردووی میللەتێك بووە و بەتوندی بە ڕەگی ڕۆحیەوە بەستراوە، ڕێگاکانی ژیان و بەرزبوونەوەی ئەو میللەتە دەکاتەوە و ڕۆشنی دەکاتەوە. بەپێچەوانەوە، هەموو ڕۆژێك کێشانی زیکزاك هاوڕێ لەگەڵ بیر و تێگەیشتن و بۆچوونی جیاوازدا، ئەو میللەتە کرمۆڵ دەکات و تەختی زەوی دەکات.

# ئازادی

ئازادی، بریتییە لەوەی ڕۆح جگە لە هەست و بیرمەرز و باڵاکان هیچ کۆت و بەندێکی دیکە قبووڵنەکات و، جگە لە خێر و فەزیلەت دیلی هیچ دەستوور و یاسایەکی دیکە نەبێت.



کەسانی وەها هەن سەرەڕای بەسترانەوەیان بە کۆت و زنجیر، هەمیشە لە ئاسمانی ئازادیی ویژدانیاندا دەفڕن و بۆ ساتێکیش هەست بە دیلی و مەحکومی ناکەن. وەلێ کەسانی وەهاش هەن سەرەڕای ژیانیان لەنێو ناز و نیعمەتی سەرنجڕاکێش و پڕشکۆی کۆشك و تەلارەکاندا، لە قووڵایی خۆیاندا هەست بە ئازادیی ڕاستەقینە ناکەن و نایچێژن.



ئەوانەی ئازادی بە سەربەستیی ڕەها تێدەگەن، بزانن یان نەزانن،

ئازادیی ئاژەڵانە و ئازادیی مرۆییانە تێکەڵاو دەکەن. ئەمە لە حاڵێکدا، ئەو سەربەستییەی کە دەروونە بەرەڵاکان بە مەبەستی هێنانەدی داخوازییە تاریکەکانی لاشە و جیسمانییەت پەنای بۆ دەبەن، بە تەواوەتی دروشمێکی ئاژەڵانەیە، بەڵام ئەو ئازادییەی کە بە هەڵگرتنی بەربەستەکانی بەردەم ڕۆح زەمینە بۆ باڵگرتنی ویژدان سازدەکات، دروشمێکی تەواوەتیی مرۆییانەیە.

***

ئازادی، دەکرێت بەم جۆرەش لێکبدرێتەوە: بریتییە لە ئازادبوونی هێزی مرۆڤ لە سەرجەم ئەو کۆت و بەندانەی کە ڕێ لە پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی دەگرن.

***

ئازادی بە مرۆڤ دەڵێت "دەتوانیت هەر شتێك دەتەوێت بیکەیت، بەمەرجێك ڕەچاوی حەق بکەیت و زیان بە کەسانی دی نەگەیەنیت."

***

ئازادیی جوان و قبووڵکراو، ئەو ئازادییەیە کە خاوەنی شارستانێتیشە. ئەویش ئەو ئازادییەیە کە بە زنجیری ئەڵماسی دین و ڕەوشت و، قایشی زێڕینی بیرکردنەوەی تەندروستەوە بەستراوەتەوە.

***

ئەو ئازادییەی کە هەستی ئایینی و بیری دینی ناناسێت و، گرنگی بە ئەخلاق نادات و، نابێت بە شەتلگایەك بۆ فەزیلەت و خەسڵەتە چاکەکان لە نەخۆشییەکی وەك گەڕی و گوڵی دەچێت کە هەموو میللەتێك ڕقی لێیەتی و لێی ڕادەکات. ئەو کۆمەڵگایانەی ئەم نەخۆشییەیان تووشدەبێت، هەروەك

زوو یان درەنگ تەندروستی و سەلامەتی خۆیان لەدەستدەدەن، بەهەمان جۆر بە تێپەڕینی کات چواردەورەکەشیان دەدۆڕێنن.

# شارستانێتی

شارستانێتی، دەولەمەندی و نەزاکەتی ڕواڵەتی و دابینکردنی چێژە جەستەییەکان و سووڕانەوە و نوقمبوونی لاشە لەنێو هەرزمییدا نییە. بەڵکو شارستانێتی بریتییە لە دەولەمەندیی دڵ و، نەزاکەتی ڕۆح و، قووڵی بیر و بۆچوون و، دانتان بە مافی ژیانی کەسانی دی و قبووڵکردنیان.

***

شارستانێتیی ڕاستەقینە هەمیشە لەو هەرێمانەدا دەرکەوتووە کە تێیدا زانست و ئەخلاق پێکەوە و هاوشانی یەکتر پێشڕەوییان کردووە. لەم ڕووەوە، شارستانێتیی ڕۆژئاوا کە هەموو شتێکی تەنها لە ڕوانگەی زانستەوە هەڵسەنگاندووە، هەمیشە بە نیفلیجی ماوەتەوە؛ شارستانێتییەکانی ڕۆژهەڵاتیش کە دەرگایان بە ڕووی زانستەکاندا داخست و لەناو خۆیاندا خۆیان زیندانی کرد. لە ئێستادا ئەگەر بەشێوەیەکی هەندەکیش بێت، لەناو وەحشەت و نامۆییدان. شارستانێتیی داهاتوو، لە شەتلگای زانست و هونەری ڕۆژئاوا و باوەڕ و فەلسەفەی ئەخلاقی ڕۆژهەڵاتدا سەوزدەبێت و نەشونما دەکات.

***

شارستانێتییەك پاڵ بە ئەخلاق و فەزیلەتەوە نەدات و، لە حەوزەکانی عەقڵ و ویژدان پاراونەکرێت، ڕێگایەکی کاتی و ڕاگوزەری وەهایە کە

خزمەت بە هەندێك دەوڵەمەند و هەوەسی هەندێك لە هەواپەرستان دەکات.
بەدبەختی و سەرگەردانی بۆ ئەوانەی بە تیشکە هەڵبووە و کوژاوەکانی
فریودەخۆن!

***

نابێت وابزانرێت کە شارستانێتی بریتییە لە پێشکەوتنی زۆر لەبواری
زانستە سروشتییەکان و هونەرە جۆراوجۆرەکاندا و، بوون بە خاوەنی کەشتی
و شەمەندەفەر و فڕۆکە و ئامرازە مۆدێرنەکانی دی و، ژیان لەناو شاری
گەورە و شەقامی فراوان و بینای بەرزدا. دانانی ئەم شتانەی کە لە دەستی
کەسانی باوەڕدار و خاوەن ڕاستڕەویدا تەنها ئامرازی شارستانێتین، بە خودی
شارستانێتی! جگە لە خەڵەتان چیتر نییە.

***

پێویستە لەوەدا بەدوای شارستانێتیی تاکەکاندا بگەڕێین کە ناوك و تۆوی
شتە جوان و باشەکانی ناو ناخ و ناوەڕۆکی مرۆڤ بە گەشەکردنی بەردەوام
فێترەتێکی دووهەمیان لێ پێکبێت. ئەوانەی جلوبەرگ و چێژوەرگرتن
لە هەموو جۆرەکانی لەزەتە جەستەییەکان بە شارستانێت هەژماردەکەن،
هەندێکیان کۆمەڵێك بێبەشن لە داوەریی ژیری و، هەندێکی دیکەشیان
کۆمەڵێك چارەڕەشی وەهان کە بوون بەژێر داخوازییە بێسنوورەکانی ژیانی
جەستەییەوە.

***

هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە میللەتە وەحشی و دەشتەکییەکان خوێنخۆر
و ستەمکار و تالانکارن. ئەرەندە هەیە چونکە حاڵی ئەمان لای هەموو
کەسێك ئاشکرا و زانراوە، ئەوە شتێکی زانراوە ئەوەش حەقیقەتە کە بۆ

کەسانی تر زۆر زیانبەخش نین. ئەی دەبێت چی بوترێت دەربارەی ئەو مەدەنییە دەشتەکییانەی کە بە چەکە مۆدێرنەکان پڕچەک بوون و هەمیشە بەدوای هەلی خوێنخۆریدا دەگەڕێن؟!

***

شارستانێتی، ئەگەر بریتیبێت لە گوزارشتکردن لە بوونی میللەتێک لەلایەن خۆیەوە، ئەوا پێویستە کەرەستەی ئەم وتارە پڕشکۆیە، زانست و ئەخلاق و بەرهەمە تەکنەلۆجییەکانی ئەو میللەتە بێت. چونکە پەروەردەی کۆمەڵایەتی و هونەر و سنعەتە جۆراوجۆرەکان شکڵ و شێوەیەک بە شارستانێتی دەبەخشن؛ بەڵام ئەخلاق، بەوێنەی زمانێکی ڕەوان و پاراو، گوزارشتی لێدەکات و ڕایدەگەیەنێت.

# پێشکەوتن

گەشەکردن و پێشکەوتنی میللەتێك وابەستەی پەروەردەبوونی تاکەکانی ئەو میللەتەیە لە بوارەکانی فیکر و هەستدا. ئەو میللەتانەی ڕۆشنبوونەوەی بیر و دونیای ناوەوە لە تاکەکانیدا گەشەی نەکردبێت، ناتوانرێت چاوەڕێی پێشکەوتنیشیان لێبکرێت.

***

لە بەرزبوونەوەی میللەتاندا، گەیشتنی تاکەکانی کۆمەڵگا بە یەکێتیی ئامانج و مەبەست مەرجێکی سەرەکییە. لە کۆمەڵگەیەکدا کە یەکێك بڵێت سپی و یەکێك بڵێت ڕەش، ئەگەر گاه بەرەو ڕاست و گاه بەرەو چەپیش هەڵسوڕتین هەبێت، هەرگیز بەرزبوونەوە و پێشکەوتن تۆمارناکرێت.

***

ئەو ئەوانەی پەروەردەیەکی هاوبەشیان نەدیوە، بەگوێرەی ئەو کلتوورە جیاوازانەی کە وەریانگرتووە، هەمیشە بۆ گروپ و چینی جیاواز دابەشبوون و بەکتریان وەك دوژمن دیوە. چاوەڕێکردنی پێشکەوتن لە وەها کۆمەڵگایەك کە لەناو خۆیدا لێکهەڵوەشاوە، ئەگەر مەحاڵیش نەبێت، هێندە سەختە کە نزیکە لە ئەستەمەوە.

***

هەموو پێشکەوتنێك سەرەتا لەسەر ئاستی بیر و وێناکرن(تصور) دەردەکەوێت، پاشان وا لە کۆمەڵانی خەڵك دەکرێت کە باوەڕی پێبکەن،

دواتریش بە هیممەت و هەوڵی ئەو تاکانە دێتەدی کە دڵیان ناوێتەی یەکدی بووە. بەپێچەوانەوە، هەموو هەوڵێکی پێشکەوتن کە لەسەر ناستی بیرکردنەوە ڤیزەی زانستی وەرنەگرتبێت یان دووچاری بەدبەختیی دەرنەبڕران و گوزارشت لێنەکران بووبێت، مەحکومە بە مایەپووچی و بێئەنجامی.

***

پاکتر و ڕوونتر و ڕێکوپێکتر و باشتری هەموو شتێك ئەو بەشەیەتی کە گەشەی کردووە و پێشکەوتووە. لەم ڕوانگەیەوە، قایلبوون بە بەرهەمی ئێستا کورتهێنانی هیممەتە و، تێپەڕاندنی ئێستا و هێنانەدی بەرهەمی ڕێکوپێکتر و ئاستبەرزتریش پێشکەوتنە.

***

پیسکردن و وشککردنی چیا و دەشت و، گۆڕینی باخ و بێستانەکان بە زبڵدان نزمبوونەوە و دواکەوتنە؛ خاوێنکردنەوەی ژینگە نالەبارەکان و گۆڕینی زبڵدانەکانیش بە باخ و باخچە پێشکەوتنە. میللەتانی پێشکەوتوو، نیشتیمانیان بەهەشت و، چیاکانیان باخ و، پەرستگاکانیشیان دەڵێیت کۆشکێکی شکۆدارە. لەبەرامبەر ئەمەدا میللەتانی دواکەوتوو، شارەکانیان رزرانە و، کۆڵانەکانیان زبڵدان و، پەرستگاکانیشیان دەعلیزی بۆنکردووە.

***

هەرچەندە ناکرێت کاریگەریی خوێندەواری لەسەر پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی میللەتان ئینکاری بکرێت، بەڵام چونکە ئەوەکان بە کلتووری میللی بەرەو ناڕاستەیەکی دیاریکراو پەروەردە ئەکراون، ئەنجامی چاوەڕوانکراو نەهاتووەتەدی و ناشیەتەدی...

هەموو هەوڵێکی پێشکەوتن بە ئەندازەی گرنگیدانی بە سوودوەرگرتنی باش لە حاڵی حازر و کەڵك وەرگرتن لە ئەزموونی نەوەکانی ڕابردوو ئەنجامی دەبێت. بەپێچەوانەوە، ئەگەر هەموو نەوەیەکی نوێ بیر لە سوودوەرگرتن نەکاتەوە لە ئەزموونی ئەوانەی پێش خۆی و، هەرکەسە و بە ڕێیەکدا بڕوات، ئەگەر لەئەنجامی ئەم هەڵسوکەوت و خووە منداڵانەیەدا هەمیشە لەناو خۆشیاندا مقۆمقۆیان بێت، هێشتا بەقەدەر دەنکە جۆیەکیش ناتوانن ڕێ ببڕن.

# هونەر

هونەر، ڕۆحی پێشکەوتن و گرنگترینی ئەو ڕێگایانەیە کە فراوانی بە هەستەکان دەبەخشن. ئەو توانا و لێهاتنە بەدبەختانەی کە هەلی بەکارهێنانی ئەم ڕێگایە لەدەستدەدەن، بەدرێژایی تەمەنێك، چەشنی خەڵکانی ئیفلیج، هەمیشە لایەکیان بەمردوویی دەمێنێتەوە.

***

هونەر، وەك کلیلێکی ئەفسووناوی وەهایە کە گەنجینە نهێنییەکان دەدۆزێتەوە و دەیکاتەوە. لە پشتی ئەو دەرگایانەدا کە بەهۆی ئەوەوە دەکرێنەوە، فیکرەکان جلی ڕەنە دەپۆشن و خەیاڵەکانیش وەك بڵێیت بەرجەستە دەبن.

***

ئەگەر هەڵۆیەکی بیرکردنەوەی وەها هەبێت کە لە قووڵایی و ناکۆتایی

دەریاکاندا و لە بەرزی و شینیتی ئاسمانەکاندا گەشت بە مرۆڤ بکات، ئەوە هونەرە. ئادەمیزاد لەسایەی هونەردا چارژکە بە ڕووی زەوی و ئاسمانەکاندا هەڵدەدات و، بە کۆمەڵێك هەستکردنی وەها دەگات کە لەسەروو کات و شوێنەوەن.

***

یەکێك لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە هاوڕێ لەگەڵ پاراستنی هەستی مرۆییدا، هەمیشە بەوزترینی ئامانجەکان نیشانی ئەو هەستانە دەدات و، ڕۆحە هەستیارەکانی لەم قووڵی بۆ ئەو ڕەهەند ئاراستەدەکات، هونەرە. ئەگەر هونەر نەبوایە، لە جیهانی دەستێوەردان و داهێنانی مرۆڤدا، هیچ یەکێك لەم جوانییانەی ئێستامان نەدەدی. وە ڕۆحە ئاگرین و هونەرمەندەکانیش هاوڕێ لەگەڵ سەرجەم نەخشە و پلان و وێنا و تەسەوورەکانیان لەژێر خاکدا دەپووکانەوە...

***

یەکەمین تابلۆیەك کە نەخشی قووڵاییەکانی مرۆڤ نیشانبدات هونەرە. بەڵێ، لەسایەی هونەردایە کە قووڵترینی هەست و بیرەکان و، بڕیارە هەرە ڕاست و دروستەکان و، قووڵترین ئارەزووەکان، وەك ئەوەی لەسەر کاشێنك تۆمارکرابن تۆماردەکرێن و، وەك بڵێیت جاویدانی و ئەمری بەدەستدەهێنن.

***

مەگەر هەر لەسایەی هاوڕێیەتی نێوان هونەر و ئیماندا نەبوو کە ئەم دونیا شکۆدارە بە خۆی و پەرستگا بالگرتووەکانی و، منارەکانی کە هەرتەی پەنجەی شایەتمان جیهانەکانی ئەودیو نیشانئەدەن و، نەخشی پیرۆزی نێوچاوانی مەرمەڕەکان و، هونەری جۆراوجۆری خۆشنووسییەکان

و، زاخاودانە جوان و ڕازاوەکان و، نەخشە هەڵکۆڵراوە زەردەنەبووەکان و، ئەو نیگارانەی کە هێندەی باڵی پەپوولە جوانن و هەموویەکەیان بە پەیامێک دادەنرێن، حاڵەتی گالەرییەکی هێندە جوانی وەرگرت کە چاو لە تەماشاکردنی تێرنابێت.

***

زانستی ڕاستەقینە هاوڕێ لەگەڵ هونەردا خۆی نیشاندەدات. کەسێک هیچ شتێکی هونەری نەهێنابێتە مەیدان، ناتوانرێت بوترێت کە دارای شتانێکی زۆر دەزانێت.

***

زیندوویەتی توانا و لێهاتنەکانی مرۆڤ پەیوەندییەکی نزیکی بە ڕۆحی هونەرییەوە هەیە. مرۆڤێکی بێ هونەر و دوور لە هونەر، ئەگەر مردووش نەبێت، بە زیندوو نەژمارناکرێت.

***

هەموو ئەو هەوڵە هونەرییانەی کە لای ڕۆحە هونەرمەندەکان بەهایان نییە و ڕەواج پەیداناکەن، سەرنەکەوتنیان لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ناتوانن ڕۆح و شکڵ لەیەکتر جیابکەنەوە.

***

هیچ گومانێک لەوەدا نییە کە قبووڵکران و گرنگیپێدان و بەرزنرخاندنی هەر بەرهەمێکی هونەری، لە خودی خۆی زیاتر، ڕووی لەو هونەر و کارامەییەیە کە لە ڕۆحیدا هەڵیگرتووە.

***

ئەوە هونەرە کە ئاسن لە زێڕ و مسیش لە برۆنز بەنرختر دەکات. بەڵێ، لەسایەی هونەردا بێنرخترین کانزاکان، لە زێڕ و زیو و ئەڵماس زیاتر نرخ پەیدادەکەن.

* * *

تێکڕای ئەو هونەرە جوانانەی کە لەسەر هێڵی بیرکردنەوەی خۆمانن. هەروەك دیاریی نەمریی ڕۆحە هونەرمەندە پیرۆزەکانن بۆ مرۆڤایەتی، بەهەمان جۆر هەر لەو کانزمێزانەوە کە کاتمان پێڕادەگەیەنن هەتا ئەو چاویلکانەی کە لە کاتی لاوازییاندا هێز و فەڕ بە چاومان دەبەخشن؛ لەو بێتەل و تەلەفۆنانەوە کە مەودا دوورەکان نزیکدەکەنەوە هەتا ئەو تەلەفزیۆنانەی کە دەنگ و ڕەنگەکانی هەر چوار لای دونیا ڕادەکێشن و لەو ژوورەدا دەیدەنەوە کە تێیدا دانیشتووین؛ هەر لەو ئۆتۆمبێل و شەمەندەفەر و فڕۆکانەوە کە لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی دی دەمانبەن هەتا کەشتییە ئاسمانییەکان و گشت ئەو ئامراز و ئامێرانەی تر کە بە هۆکاری ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانیی مرۆڤ دادەنرێن. هەموویان بەرهەمی ئەو ڕۆحە ئاسك و هەستیارانەن کە بەڕووی هونەردا کراوەن.

* * *

تێکڕای ئەو ڕۆحانەی بە ڕووی هونەردا داخراون، بوون و نەبوونیان هاوتای یەکە؛ بریتین لە هەندێك کەسانی وشك و بڕنگی وەها کە سوودیان بۆ خۆیان و خێزان و نەتەوەیان نییە و، بگرە زیانبەخشیشن.

# ئەدەبیات

ئەدەبیات، زمانێکی گۆیای پێکهاتەی ڕۆح و، دونیای فیکر و ژیانی عیرفانی هەر میللەتێکە. ئەو تاکانەی لە هەمان پێکهاتەی ڕۆحی و سیستەمی فیکری و ژیانی عیرفانیدا هاوبەش نین، ئەگەر سەر بەهەمان میللەتیش بن، مەحاڵە لە یەکتری تێبگەن.

***

وتە، یەکێکە لە گرنگترینی ئەو هۆکارانەی کە بیر و هزر لە دەماغێکەوە بۆ یەکێکی تر و لە ڕۆحێکەوە بۆ ڕۆحێکی دیکە دەگوازێتەوە. ئەو ئەربابی فیکرەی کە دەتوانن ئەم ئامرازە بەسەرکەوتوویی بەکاربهێنن، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا چەندین نمایندە دەبیننەوە بۆ نوێنەرایەتیکردنی ئەو بیر و هزرانەی کە لە ڕۆحەکاندا هەوێنەکەیان داناوە و، خۆیان و فیکرەکانیان بە جاویدانی دەگەن. ئەوانەش کە ئەم توانایەیان نییە، هاوڕێ لەگەڵ ئەو ژانە فیکرییانەدا کە بەدرێژایی ژیانیان چەشتوویانە، بێئەوەی شوێنەوارێك لەدوای خۆیان جێبهێڵن دەسڕێنەوە و دەڕۆن.

***

هەر جۆرێك لە جۆرەکانی ئەدەبیات، بە خۆی و جۆراوجۆریی ئەو کەرەستەیەی بەکاری دەهێنێت و، ئامانج و مەبەستەکەی و، تایبەتمەندییەکانی لە کاتی جێبەجێکردندا، زمانێکی سەربەخۆی باسکردن و ڕوونکردنەوەیە و زارێکی تایبەتە بەو جۆرە. ئەگەر هەموان شتێکیش لەم زمانە تێبگەن

تەنها ئەوە شاعیران و ئەدیبانن کە دەتوانن بەشێوەیەکی ڕاستەقینە ئەو زمانە بەکاربهێنن و قسەی پێبکەن.



هەروەك چۆن زێڕنگەران لە زێڕ و زیو تێدەگەن، تەنها زێڕنگەرانی وشەش لە گەوهەری وشە سەردەردەکەن. گوڵێکی کەوتوو لەسەر زەوی، ئاژەڵ دەیخاتە دەمی و دەیخوات، پێنەزان قاچی پێدا دەنێت، بەڵام مرۆڤەکان بۆنی پێوە دەکەن و لە بەخە و سنگیانی دەدەن.



هزر و چەمکە بەرز و باڵاکان، دەبێت بە شێوازێکی بەرزی وەها پێشکەشبکرێن کە بچنە ناو زەمینەکانەوە و، جۆشوخرۆش لە دڵاندا بێداربکەنەوە و، لە ڕۆحەکانیشدا قبووڵبکرێن. ئەگینا لەوانەیە هەندێك لە ڕواڵەتپەرستان تەماشای عەبای شڕ و دڕاوی سەرشانی مانا بکەن و، بەمەشدا بڕیار لەسەر بێنرخیی گەوهەرەکەی ناوی بدەن.



ئەگەر ئەدەبیات نەبوایە، نە حیکمەت ئەو پێگە شکۆدارەی خۆی وەردەگرت، نە فەلسەفە دەیتوانی بەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ بگات، نە وتاربێژیش دەیتوانی ئەو شتە ببەخشێت کە لێی چاوەڕواندەکرێت. ئەوەندە هەیە هەریەك لە حیکمەت و فەلسەفە و وتاربێژیش دەوڵەمەندیی بوار و کایەکانی خۆیان لەشێوەی سەرمایەیەکی نەبڕاوەدا هەڵڕشتووەتە بەردەم ئەدەبیات و، ئەمریان پێبەخشیوە.



ئەدیبان و شاعیران لە دونیای ناوەوە و دەرەوە (دەروون و ئاسۆ)دا لە ئەزمێنێك دەچن کە گوزارشت لەو شتانە دەکەن کە دەبینن و هەستی پێدەکەن. مرۆڤەکان بەهۆی ئەمانەوە پەی بە مانا و چییەتی ئەو دەنگانە دەبەن کە لەم کۆرسە قەرەباڵغەوە بەرزدەبنەوە، دەنا ئەو کەسانەی بینا گان لەو بلیسانەی کە هاوڕێ لەگەڵ هەستەکاندا دێن و ڕۆحیان دەتەنن، نە لە نەی و نە لەو داد و هاوارەش کە لە نەیەوە بەرزدەبێتەوە ئەستەمە تێبگەن.



هەموو لقێکی هونەر و هەموو بەرهەمێکی هونەری، بەمەرجێك سەرچاوەکەیان پاك و ڕوون بێت لەو ڕووەوە کە گوزارشت لە جوانیی هەرێمی جۆراوجۆر و گوڵ و میوەی ئەو هەرێمە هەمەجۆرانە دەکەن، جوان و خۆشەویست و قەشەنگن.



ئەدەبیاتیش وەکو هەر یەکێك لە جۆرەکانی دیکەی هونەر، هاوڕێ لەگەڵ حاڵ و چۆنێتی و ڕەهەندەکانی وەك هەست و، ئاوێتەبوون لەگەڵ شتان و، ئامانج و، بەرزبوونەوە بەسەر کاتدا، بە هەمیشەیی و نەمری دەگات، لەبەرئەوە. زۆر گرنگە هونەرمەندیش هەموو ئەو شتانە تێبپەڕێنێت کە دەبینرێن و هەستیان پێدەکرێت و، دڵی بۆ ئەو شتەبایانە ئامادەبکات کە لە جیهانەکانی ئەودیوەوە هەڵدەکەن.



لە بابەتی دەربڕینی ئامانج و مەبەستەکاندا، پێویستە هەر وتەیەکی سەرەوادار و هەر پەخشانێك کە بەکاردەهێنرێن، وەکو سەدەفێکی پارێزەر وابێ بۆ گەوهەری بیر و هزر، نابێت جێگای ئەم بگرنەوە و شوێنی بێ لەق

بکەن. ئەم سەدەفە ئەگەر لە زەبەرجەدیش بێت، بە ئەندازەی شاردنەوەی ناوەرۆك و مەبەست و ئامانج، کاریگەری و هێزی وریاکردنەوەی هەستەکان لەدەستدەدات و، مەحاڵە وتەیەکی لەم جۆرەش تەمەندرێژ بێت.

***

زمان، لەپاڵ ئەوەدا کە ئامرازی گوزارشتکردنە لە بیر و بۆچوون و تێگەیشتن، پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە بابەتەکانی وەك هونەر و جوانی و ئەدەبیشەوە هەیە و، پێدەچێت وشەی "ئەدەبیات"یش دەرخەری ئەم لایەنەی ئەو بێت.

***

ماکی سەرەکی لە ئەدەبیاتدا مانایە. لەم ڕوانگەیەوە پێویستە شتانی وتراو کورت، بەڵام پڕ و زەنگین بن. هەرچەندە هەندێك کەس ویستوویانە لەڕێگەی زاراوەکانی وەك چواندن و ڕەگەزدۆزی و تیلنیشان و هاوشێوەکانیانەوە کە بەشێك بوون لە بابەتی ڕەوانبێژی و خۆشخوانی لای خەڵکانی پێشین، ئەم بابەتە ڕوونبکەنەوە؛ بەڵام بەڕای من پێویستە لەو ڕۆحانەدا کە بە هەمیەجان خرۆشاون و، لەو خەیاڵە فراوانانەدا کە دەزانن چۆن هەموو بوون بپێچنەوە و لە دڵیاندا جێی بکەنەوە و، لەو دەماغە باوەڕدار و خاوەن توانای پێکهێنان(الترکیب)انەدا کە سەرکەوتووبوون لە موتاڵاکردنی دونیا و عوقبا وەکو دوو ڕووی جیاوازی یەك حەقیقەت، بەدوای قووڵترین و مانابەخشترینی وتەکاندا بگەڕێین.

هەروەك چۆن شارستانیتی و کلتووری جۆراوجۆر لە سەرزەویدا هەن، بوونی چەندین ئەدەبیاتی جۆراوجۆریش شتێکی سروشتییە. ئەوەندە هەیە ئەدەبیات، هاوڕێ لەگەڵ ئەدەبی ناو ڕۆحی و، خۆشەویستیی جوانی و،

خەت و نەغمەی تایبەت بە کتێبی سروشت، سەرەڕای ئەوەی چەندین ڕووی هەمەجۆری هەیە، بەڵام دیسانیش گشت(کل)ێکی تاقانەیە و ییکوملز گشتگیر و جیهانییە.



هەموو ڕاستییەک سەرەتا لە ڕۆحی مرۆڤدا لەشێوەی کاکڵەیەکدا وردەکەوێت؛ پاشان هەستی پێدەکرێت؛ پاشان بەهۆی وشە و قەڵەم و چەکوش بەرجەستەدەکرێت و، هەوڵدەدرێت خاڵ بە خاڵ و خەت بە خەت لە سیمای بەرهەمێکی هونەریدا، یان لە بەرهەمێکی هونەریدا گوزارشتی لێ بکرێت. گەیشتنی بەرهەمێکی لەم جۆرەش بە ڕەهەندەکانی سەروو کات و شوێن، بەتەواوەتی وابەستەی باوەڕ و پلەی عەشقی ناو ئەو باوەڕەیە.



لەوانەیە هەندێک جار لەنێوان خەڵکانی هەمان شوێنیشدا جیاوازی و پێکدادانی ئەدەبی ڕوویدات. ئەم جیاوازییەی کە پەیوەندی بە ڕووکاری دەرەکییەوە هەیە، لە هۆکارەکانی وەک جیاوازیی ڕوانگە لە تەماشاکردنی شتان و ڕووداوەکان و، قبووڵکردن یان نەکردنی باوەڕ و بەهاکانی دیکەوە سەرچاوەدەگرێت. هەروەک چۆن سەبارەت بەوەی کە لەسەر لووتکەی چیایەکە، نەغمەی تایبەت بە ئەوانەی لە بنکی دۆڵەکەدان وەک گرمەگرمی پێمانا دێتە بەر گوێ، بەهەمان جۆر ئەوانەی ناو دۆڵەکەش لەوانەیە وشەی ئەوانەی سەر لووتکەکە بە تەقەتەق ئەژماربکەن.



بەرهەمێکی هونەریی باش پەیوەندی بە کاملیی ئەو ماکانەوە هەیە کە هێنراونەتە مەیدان، کاملیی ئەمانیش پابەندی کاملیی تاک تاکی

ئەو جوزنانەن کە پێکیان دەهێنن. لە جێیەکدا کاکڵە و ناوەڕۆک ساغ نەبێت هەستی پاک نابێت، لە شوێنێکیشدا کە هەستی پاک نەبێت، مەحاڵە بەرهەمی پشکۆناسا و گوفتاری بلیمەداری وەها بێنە گۆڕێ کە بۆ هەمیشە بەزیندوویی بمێننەوە.

***

ئەدیبیش بەوێنەی هەموو هونەرمەندێکی تر، لە ڕەنگ و شکڵ و خەت و شێوەی گەردووندا بەدوای شتانێکی تایبەت بە خۆیدا دەگەڕێت. ئەو ڕۆژەی کە ئەو شتانە دەدۆزێتەوە کە عەوداڵیانە و دەتوانێت گوزارشتیان لێبکات، قەڵەمەکەی خۆی دەشکێنێت و، قڵچەکەی فڕێدەدات و، لەنێو سەرسامی و سەرسوڕماندا لە هۆش خۆی دەچێت. لەبەر ئەم هۆیە پێویستە لەناو ئەو کەسانەدا بەدوای هونەرمەندە هەرە مەزنەکاندا بگەڕێین کە بەندەی خوان و، ڕۆشنبیرن و، هاوڕێ لەگەڵ شعوور و ویژداندا دەژین.

***

# شیعر

شیعر، جگە لە گوزارشت لێکرانی شاعیرانەی ئەو جوانی و هاوناهەنگییەی کە لە ڕۆحی گەردووندا شاراوەیە و، ئەو خەندە و سەرنجڕاکێشی و دڵڕفێنییەی کە بە ڕوخساری بوونەوە دەردەکەوێت، چیدی نییە. لەنێو ئەم ڕۆحە بڵندانەدا کەسانی وایان تێدایە کە دڵیان بووە بە هۆقەیەک و، لە قەسەکانی (روح القدس)یش بووە بە مرەکەبیان.

***

شیعر، ئەو "هاتوهاوار"ەیە کە لە ڕێگای پەیبردن بە جیهانەکانی ئەودیودا دەبیسترێت. یان نالەی ئەو هەولانەیە کە لەم پێناوەدا دەدرێن. دەنگ و نەغمەکانی ناو شیعر، بەگوێرەی حاڵەتی ڕۆح و قووڵیی ناخ لە دەمی وترانیدا، وەکو ئاوێک، گاه هاوڕێ لەگەڵ گرمەگرم و هاژەهاژ و، گاهیش وردە وردە و نەرم نەرم ڕێدەکات. لەم ڕوانگەیەوە. دەنگ و وتەکانی ناو شیعر، تەنها لەو حاڵەتە ڕۆحییەدا بەتەواوەتی دەرکیان پێدەکرێت کە وتراون.

***

شیعر، بەگوێرەی ئەو باوەڕ و کلتوور و شێوازی بیرکردنەوەیە لەدایکدەبێت و شێوە وەردەگرێت کە کاریگەری لەسەر بۆچوون و تێگەیشتن و هەستکردنی شاعیر دادەنێن. ئەوەندە هەیە ئەو تاکە سەرچاوەیەی کە قووڵی پێدەبەخشێت و دەیگەیەنێت بە ئاستێکی سەروو ئیدراک، تەنها ئیلهامە. لە سینەیەکدا کە بە ئیلهام خۆشایێت، گەردیلە دەبێت بە خۆر و، دڵۆپیش بە دەریا.

لە شیعردا، ڕۆڵی عەقڵ و هزر چەندەش گەورە بێت، دیسانیش دڵ و دەروونی مرۆڤ لەپێش هەموو شتێکی دییەوە لایەنێکی قووڵی ئەو پێکدەهێنن. وە بە گوتەی "فوزولی"، "وتەم، میری لیوای لەشکری شاعیرانە". ئەو بیرانەی کە لە دەرووندا سەوزدەبن، ئەگەر بەهۆی خەیاڵیشەوە باڵ بگرن، دەفڕن و پاڵ بە دەرگاکانی جاویدانییەوە دەنێن.

***

شیعر، مەشخەڵێکە ئێستا ڕووناکدەکاتەوە و، پلاجکتۆرێکە نوور بەسەر داهاتوودا دەپرژێنێت و، بەستەیەکی عەشق و هەیەجانی وەهایە کە سەرچاوەکەی لە جیهانەکانی ئەودیوەوە هەڵدەقوڵێت. لە هەرێمی شیعری ڕاستەقینەدا چاوەکان بە ڕووناکی دەگەن، دوورەکان نزیکدەبنەوە و ڕۆحەکان بە عەزم و شەوقێکی ئەکوژاوە دەگەن.

***

شیعرەکانیش بەرەنەی دوعا و پاڕانەوەکان، هەڵبەز و دابەزی دونیای ناوەوەی مرۆڤ و، حاڵەتەکانی وەك شەوق و حوزن دەهێننە سەر زمان و، بەئەندازەی چڕبوونەوەی تاکیش لەسەر حەقیقەتە بەرزەکان، شێوەی هەناسەی لاهوتی وەردەگرن. لەڕاستیدا هەموو موناجاتێك شیعرە و، هەموو شیعرێکیش موناجاتە. ئەوەندە هەیە شیعر پێویستە بزانێت چۆن بەرەو ئەبەدییەت لە شەقەی باڵبدات.

***

شیعرێك کە لە بیری ئەمریدا سەوزبووە و، بەهۆی باڵی دڵ و هێزی

ڕۆحیشەوە لە ئاسمانەکانی بیرکردنەوەی پاك و ڕووندا دەستی بە پەرواز کردووە، هاوشێوەی زانستەکان گرنگییەکی زۆر بە بیرکردنەوەی ئەزموونگەرایانە نادات. ئەو، تەنها وەکو ئامرازێك خۆی لەگەڵ شتانی دیاریکراو(مشخص) سەرقاڵدەکات. ئامانجی سەرەکیی ئەو بریتییە لە دۆزینەوەی شتانی پەتی(مجرد) و ڕاوکردنیان.

***

ئەگەر هەموو ئەو شتانەی ناو شیعرێك کە هەستیان پێدەکرێت و بیریان لێ دەکرێتەوە، بتوانرێت تەسەووریکرێن و، تەسەوورەکانیش بەبێ خڵتە بەناو بێژنگی داوەریی ژیریدا بتوانن تێبپەڕن، پاشانیش ئەم ماکە نهێنییانەی کە لە دونیای ناوەوەی شاعیردا هەریەکەیان لەشێوەی سروەیەکدا دەرکەوتوون، گەر هەتا ئەو کاتەی کە لە ڕێگەی وشە و ڕستەوە هەناسەیەك دەدەن بوون و زیندوویەتی خۆیان بپارێزن، مانای وایە ئەو شیعرە کاندیدە بۆ مانەوەی بەردەوام و، تازەیی و زیندەیی هەمیشەیی. ئەگینا ئەو شتانەی کە بە ناوی شیعرەوە دەیخەینە گۆڕێ، لەگەڵ ئەڵقەیەکی مس کە نقێمی زمەرجەدی لەسەر بێت و، لەگەڵ پارچە ئەڵماسێك کە گەردنبەندەکەی خەڵووز بێت، هیچی جیاوازییەکی نابێت.

***

شیعر، چونکە گەڕانی بەدوای "مەوجودی مەجهول"دا وەکو ئامانج بۆ خۆی هەڵبژاردووە، دەنگێکی فرمێهەندی وەهایە کە لەسەر ئاستی بیر و هزر ڕازئامێزە و، ئەو ڕێگایانەش کە دەیگرێتەبەر تاریك و ئەنگوستەچاو و، لە زۆر ڕوویشەوە ڕۆڵەی هەرێمی داخراو و ئاڵۆزی وەهایە کە بە زەحمەت مرۆڤ دەتوانێت لێی تێبگات. لەبەر ئەم هۆکارمیە کە لە هەموو وشە

و ڕستەیەکی شیعری ڕاستەقینەدا هەست بە موشاهەدە و هەستکردنی گەشتیارێکی فرەهەستیاز دەکرێت کە لە کۆشکێکی ڕازنامێز و نەفسووناویدا هەموو بیستنێك و بینینێك ڕایدەچڵەکێنن.

* * *

شیعر، داچڵەکینی دڵ و، هەیەجانی ڕۆح و، فرمێسکە، فرمێسکیش لەڕاستیدا بریتییە لەو شیعرە پاك و ڕوونانەی کە لە وشەکان یاخی بوون.

* * *

شیعر، واتە کۆمەڵێك گوڵی پەژموردەبووی شاعیران و، واتە ئەو بۆنەی کە ئەم گوڵانە بە چواردەوریاندا بڵاوی دەکەنەوە. ئەگەر خاکیان پاك و، ئاویان ڕوون و، توخمەکەشیان دیار بێت، ئیدی کەس لە ڕەنگ و بۆنی ئەم گوڵانە تێرناخوات.

* * *

ژمارەی ئەو شاعیرانەی بەبێ تێگەیشتن دەڵێن و، لەبەرامبەرشدا ئەوانەی کە ناڵێن و تێدەگەن، هەرگیز کەم نین. لەبەرامبەر لاف و گەزافی ئەوانەی یەکەمدا، ڕوانین و بیری دەستەی دووهەم، بێئەوەی پێویست بە وشە و ڕستە بکات، دەتوانن زۆر شت بۆ مرۆڤ باسبکەن.

* * *

قەتیسکردنی شیعر تەنها لە وتەی سەروادارادا، بۆچوونێکی هەڵەیە. چەندین پەخشانی وەها هەن کە ڕۆح کەمەندکێش دەکەن و، ناوەڕۆك و شێوازی دەربڕینیان سەرسامی دەبزوێنن و، هەریەکەیان پەیکەرێکی باڵای شیعرین.

***

شیعریش بەوتنەی هەریەکێك لە لقەکانی دیکەی هونەر، ئەگەر لە ڕوانگەی ئەنجامەوە دەستلەملانی ئەبەدییەت نەبێت، ئەزۆك و خامۆشە. هەریەك لە ڕۆحی ئینسان کە سەفتونی جوانییە هەمیشەییەکانە و، دڵی مرۆڤ کە ئارەزووی ناکۆتایی دەکات و، ویژدانی مرۆڤ کە جگە لە ئەبەد و ئەبەدییەت بە هیچی تر ئاسوودەنابێت، هەمیشە دەچپێنن بە گوێی هونەرمەندا بۆ ئەوەی خۆی بە کەشفکردنی جیهانەکانی ئەودیوەوە سەرقاڵ بکات. هونەرمەندێك کە هەست بەم ناڵە و تاسەیە ئەکات کە لە دڵ و ڕۆح و ویژدانیەوە بەرزدەبنەوە، بەدرێژایی تەمەن هەوڵی لاسایکردنەوەی دیوی دەرەوەی شتان دەدات و، بۆ تەنها جارێکیش لە بینینی دیوی ئەو دیوی ئەم پەردە ڕەنگاو ڕەنگە ناتوانێت سەرکەوتوو بێت.

***

گەر لە شیعردا شێوە نەکرێت بە فیدای مانا و، ماناش نەکرێت بە قوربانی شێوە، بەپێچەوانەوە هەردووکیان وەکو پەیوەندی نێوان جەستە و ڕۆح مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت، مانای وایە ئەو شیعرە دەگات بە هارمۆنییەکی وەها کە هەموو کەسێك خۆشی بوێت و بە شتێکی سروشتی بیبینێت. وە سەبارەت بە شیعرێکی لەم جۆرەش، ناتوانرێت خەیاڵی پاڵنەرێکی باشتر و تازەتر بکرێت.

***

شیعر دیوێکی دەرەکیشی هەیە کە تێیدا زیاتر وشە و ڕستە و پێوانە و ئەدا و لایەنەکانی هاوشێوەیان باڵادەستن. هەرچی دیوی ناوەوەشیەتی، لەمەیاندا ڕۆح بۆ گوزارشتکردن لەو بیر و هزرانەی کە لە جیهانی ناوەوەیدا هەوێنی کردووە، بەدوای ڕستەگەلێکدا دەگەڕێت کە چەشنی سیمای گوڵان

و باڵی پەپوولەکان ناسك و قەشەنگ بن و، گاھ عەودالی وشەگەلێك دەبێت کە بەوێنەی پزیسك لە ھەر جێیەك بنیشێتەوە تاگری تێبەربدات و، گاھ وێڵی دوای زاراوەگەلێك دەبێت ناڵەی ھاوشێوەی ناڵەی نەی بھێنێتە مەیدان. پاشان دەیانلۆرێنێتەوە و ھەریەکەیان لە شوێنی گونجاوی خۆیاندا دادەنێت. دەتوانین ئەمەش بە "بەمۆسیقابوونی شیعر" ناوزەدبکەین.

***

چونکە نھێنی و ئاماژەکان یەکێکن لە سەرچاوە سەرەکییەکانی شیعر، تیایاندا ھەست بە فراوانی و دەوڵەمەندییەکی زیاتر دەکرێت. بەڵام ئەم دەوڵەمەندییەش دیسان لەناو حەرەمی شیعردایە و بە شووراکانی ئەو دەوردراوە. شیعر، تەنانەت کاتێکیش کە لە باوەشی یادەوەرییەکاندا ڕەھەندی جۆراوجۆر وەردەگرێت و بەرەو ھەرێمی ڕەنگاوڕەنگی ماناکان دەکشێت و فراوان دەبێت، ھێشتا ھەر خۆیەتی.

***

لە شیعردا تۆنێك باڵادەستە کە لە ئەنجامی یەکگرتن و تێکەڵبوونی نێوان بیر و ھەستدا ھاتووەتە گۆڕێ. بەڵام بەوێنەی شانەی زنجیرەیەکی ڕژێنی لە جەستەی مرۆڤدا، دوو لایەنی گرنگی وەك نییەت و ڕوانگە ھەن کە لە پشتی بیر و ھەستەکانەوە حوکم دەکەن و لە ھەموو خاڵێکدا کاریگەریی خۆیان دەردەخەن. ئەمانە لە ھەموو بەیت و نیوەبەیتێکدا وەکو ڕەنگ دەدرەوشێنەوە و، لەو جێیانەدا کە فیکر قاچی دەخزێت دەستی دەگرن و، وەکو چرایەکی ئەفسووناوی لەبەردەم ھەستدا، ھەمیشە ڕووناکی بە ڕێگاکاندا دەپرژێنن.

***

شیعر، ھەناسەکانی ئەو کۆمەڵگایەیە کە تێیدا سەوزبووە، کۆمەڵگا بە

خۆی و هەموو ڕق و قین و نەفرەت و هەیەجان و ئازار و ژان و نومێد و ناتومێدییەکیەوە. شاعیریش گاه بۆرپی هەوا و سییەکانی کۆمەڵگایە و، گاهیش خودی زمان و لێویەتی. لەم ڕووەوە هەموو شیعرێك ئەگەر هاوڕێ لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی ئەو کۆمەڵگایەدا مامەڵەی لەگەڵ بکرێت و تاوتوێبکرێت کە تێیدا لەدایکبووە و کەرمستەکەی پێکهێناوە، چەندین شتی جۆراوجۆر دەتوانێت ڕوونبکاتەوە. بەڵام ئەگەر لە هەڵسەنگاندنیدا ڕەچاوی ئەو کۆمەڵگایە نەکرێت کە دایکایەتی کردووە، تێگەیشتن لێی کارێکی زۆر زەحمەتە.

## ژیان و ڕۆح

ژیان نهێنییەکی خواییە؛ ماهییەتەکەشی تەنها ئەوانە دەیزانن کە ئاشنای نهێنییە خواییەکانن.

***

ژیانی ڕەها، ژیانێکی جەستەییە. گەرمی و زیندوویەتی ناو جەستە بەتەواوەتی شتێکی فیترییە و، لە ئەنجامی گۆڕانی خۆراکی وەرگیراو بۆ خوێن و وزە دێتە بەرهەم.

***

ئامانجی ژیانی لاشە بریتییە لە جووڵە و زیندوویەتی و بەجێهێنانی هەندێك ئەرکی جەستەیی؛ ژیانێکی لەم جۆرەش لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا هاوبەشە و لەم ڕووەوە جیاوازییەکیان لەنێواندا نییە. بەڵام ژیانی ڕاستەقینەی

مرۆڤانە ژیانێکە کە لەهەمان کاتدا هەریەك لە شعوور و تێگەیشتن و کراوەبوون بەڕووی جیهانەکانی غەیبیشدا دەگرێتەوە و، ژیانی ڕاستەقینەش هەر ئەمەیە.

***

ژیان بە مانای ڕۆح نایەت. ئەو، ژیانێکی جەستەییە. هەرچی ڕۆحە، شتەلٔ و پارچەپارچە نابێت.. بوونەوەرێکی ئەزەمونیان و، "یاسایەکی ئەمری"ی خاوەن شعوورە و، لە جەوهەرە ماددییەکان جیاوازە.

***

ڕۆح، لەگەلٔ ژیاندا پەیوەندی بە جەستەوە دەکات و بە جیابوونەوەی ژیان ئەویش جیادەبێتەوە. ژیان لەناودەچێت و دەکوژێتەوە؛ بەلاّم ڕۆح بۆ هەمیشە بە ژیاندنی خوای گەورە دەژی.

***

سەرچاوەی ژیان فیترەتە و ڕەهەندەکانیشی سروشتین. بەلاّم ڕۆح نەفەسێکی خواییە و، خاوەنی پێناسێکی وەهایە کە لەسەروو فیترەت و سروشتەوەیە. ژیان دارای کۆتاییە و مردن دەیگرێتەوە؛ وەلێ ڕۆح ئەبەدی و نەمرە.

***

ڕۆح، لەسەروو میکانیزمی مێشکەوە، خودی ئەو بوونەوەرەیە کە هەستدەکات و دەبیستێت و داوادەکات و دەخوازێت. پەیوەندیشی لەگەلٔ لاشەدا، بریتییە لە دراوسێیەتییەکی کاتی و چارەنووسێکی هاوبەش.

***

ڕۆح، بوونەوەرێکی نەمری وەهایە کە هەروەك مردن کاری لێناکات و بەناسانی بەسەر چاڵی گۆڕدا تێدەپەڕێت، بەهەمان شێوە پێنەوەی بەربەستەکانی وەك بەرزەخ و مەحشەریش بەری لێبگرن، دەڕوات و بە نەبەدییەتی بەهەشت و دۆزەخ دەگات.

***

ڕۆح، گاه لەشێوەی مرۆڤدا و، گاه وەکو هەڵمێکی ناسك و، گاهیش چەشنی جەوهەرێکی دی لە ئاوێنە میسالییەکاندا یان لە خەون و خولیاکاندا ڕەنگدەداتەوە و، بەوێنەی فریشتەکان لەگەڵ خێر و بەرەکەتەکان. یان وەکو شەیتانەکان لەگەڵ شەڕ و ناتەواوییەکاندا یەکانگیرە.

***

ژیانی ڕاستەقینە ژیانێکە کە تێیدا ژیانی ڕۆحانی و جەستەیی هاوشانی یەکترن. ژیانێکی لەم جۆرە لەهەمان کاتدا تۆوێکە کە گوڵگەنمی ژیانی ڕاستەقینەی مرۆڤ لەم دونیایەدا دەگرێت و، لەودونیاشدا ژیانێکی بەهەشتییانەی وەهایە کە لق و پەل دەردەکات و نەشونما دەکات.

***

شعوور و پاکی، دەرەنجامی ژیانی دڵن.

***

لای ئەو کەسانەی ژیانێکی ناجددییانە دەژین، ژیانی دڵ بوونی نییە.. ئەوانە گریانەکانیشیان درۆیەکی جیاوازترە.

***

لەو ساتەوەی هاتوویتەتە دونیا ژیانی ڕاستەقینەی تیمە پێچراوە لە ژیانی ئاژەڵیمانەوە و، وەکو ئەمانەتێك لەپێناو گەشەکردن و گەشەپێدانیدا لامان دانراوە. هەتا ئەو کاتەش کە پەیوەندیی نێوان جەستە و ڕۆح کۆتاییدێت لە ئەستۆماندا دەمێنێتەوە.

***

مرۆڤ لەڕووی ژیانی ئاژەڵییەوە لەگەڵ ئاژەڵان تێکەڵە و، لەڕووی ژیانی ڕۆحانیشەوە هاوڕێی فریشتەکانە. ئەوانەی بتوانن بەباشی توانا و لێهاتن و دینامیکەکانی ناو خۆیان بەکاربهێنن بە تێپەڕبوونی کات سیفەتە فریشتەییەکان وەردەگرن. ئەوانەش کە توانا و لێهاتنەکانیان کوێردەکەنەوە، تەنانەت خراپ بەکاریان دەهێنن و دەیکەن بە ئامرازێك بۆ ڕووخاندن و کاولکاری، بەحەتمی زوو یان درەنگ دادەبەزنە ئاستی خوار ئاژەڵان و، تەنانەت ئاستی شەیتانیش.

## موعجیزە و کەرامەت

کەسێك باوەڕی بە موعجیزە نەبێت، مانای وایە پەی بە مەزنیی خوای گەورە و قودرەتەکەی نەبردووە. ئەو کەسەی دەڵێت "موعجیزە ناتوانێت مانگ لەت بکات". لە ڕاستیدا دەڵێت "خوا ناتوانێت مانگ لەت بکات". ئەو کەسەش کە دەڵێت "مردووان زیندوو نابنەوە". بانگەشەی ئەوە دەکات کە گوایە خوای گەورە ناتوانێت ئەو کارە ئەنجامبدات.

***

کەرامەت شتێکی دەراسای وەهایە کە لە وەلیدا دەردەکەوێت و، پشتیوانی لە موعجیزەی پێغەمبەر و پێغەمبەرایەتییەکەی دەکات.

***

کەرامەت، دیارییەکی خوایی وەهایە کە لەسەر دەستی ئەو دۆستانەی خوا دەردەکەوێ کە لافی پێغەمبەرایەتی لێنادەن. وە تەنها ئەو کەسانە دەتوانن لێی تێبگەن کە لە مرۆڤ تێدەگەن.

***

ویلایەت، مەقامی خۆشویستنی خوا و خۆشویسترانە لەلایەن خواوە. خوای گەورە ئەم بەندە ڕاستگۆیانەی بەردەرگاکەی، هەروەك دەگونجێت بەو لوتف و ئیحسانانەی کە بە خەیاڵیشدا نایەن سەرفرازیان بکات و لەناو خەڵکدا دەریان بخات، بەهەمان جۆریش دەکرێت هاوشێوەی مرواریی شاراوەی ناو سەدەفەکان، هەتا وێستگەی کۆتایی لە خۆیان و لە کەسانی دیکەشیان بشارێتەوە...

***

ئەم قامەتە باڵایانەی کە کراوەن بە ڕووی بەهرە و توانا و لێهاتنی وەهادا کە زۆر لەسەروو هەست و ئیدراك و تێگەیشتنی کەسانی ئاساییەوەن. لە ڕوویەکەوە نوێنەرایەتی سێبەری حەقیقەتی پێغەمبەرایەتی دەکەن. دووری ئەم نێوانەش بەگوێرەی ئەمەیە.

***

وەلی، بە مانای "خاوەن حیکمەت" دێت. حیکمەت چەند لە فەلسەفە بەرزترە وەلیش ئەوەندە لە فەیلەسوف گەورەترە، ئەمانەت بەجۆرێك کە بەراوردناکرێن...

# خەون

خەون بریتییە لە بینینی هەندێك ڕووداوی ڕابردوو و داهاتوو وەکو خۆیان یان هاوڕێ لەگەڵ هەندێك هێما و ئاماژەدا لە ڕێگەی ئەو پەنجەرانەوە کە بەسەر جیهانی حەقیقەتدا کراوەن. بە ئەندازەی دوورکەوتنەوەی زیهنی مرۆڤ لە فشارە جۆراوجۆرەکان و بڕیارە لەپێشینەکان، هەموو خەونێك وەکو ڕووناکییەك کە لە جیهانەکانی غەیبەوە دێت، دەتوانێت تاریکییەکانی بەردەم مرۆڤ ڕۆشنبکاتەوە و ڕێی نیشانبدات.

***

لەبەرئەوەی لە خەوندا پێویست بە چاو و مادده و ڕووناکی ناکات و، شتانی بینراویش بەهۆی بەسیرەت و ئیدراکی ڕۆحەوە هەستیان پێدەکرێت، زۆرجار شتانی وا جوان و فراوان بۆ مرۆڤ باسدەکەن کە لە وێناکردنەوە دوورە. زۆرجار زانیاریی فراوان دەربارەی دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەینێ بەجۆرێك کە لە چەند کتێبێکدا جێگەی نەبێتەوە، لە ڕێگەی خەونێکەوە دەدرێت.

***

پێدەچێت کەس نەبێت کە خەو نەبینێت. لەم ڕووەوە دەتوانین بە ئەرشاهەدەی سروشتیی ڕۆح ناوزەدی بکەین. بەهۆی ئەم موشاهەدەیەوە مرۆڤ دەچێتە دەرەوەی سنووری جیسمانییەتی خۆی و، لە ڕەهەندێکی تەواو جیاوازدا دەژی و، لەوانەیە پەی بە چەندین نهێنیی قەدەریش ببات...



نەو خەونانەی کە وەك خۆیان هاتوونەتە دی نەوەندە زۆرن کە نەگەر هەموو کەسێك تەنها نەو خەونانەی تۆماربکردایە کە لێکدانەوەکەیان هاتووەتە دی، چەندین بەرگ کتێبی پڕدەکردەوە.



چەندەها خەونی وەها هەن کە بەگوێرەی توانا و لێهاتنی دڵە پاك و خاوێنەکان، لە جیهانەکانی غەیبەوە بۆ ناسۆی موشاهەدەی مرۆڤ دێن و، دڵ لەو خەونانەدا گەشت و سەیرانی خۆی دەکات و، دەگات بە حەوزی کەوسەری نەو باخچانەی کە هەریەکەیان وەك باخی گوڵ وان و، هەتا تێربوون لێی دەخواتەوە و، لەو دەلاقە نهێنییانەوە کە بە ڕووی نەبەدییەتدا کراون، بە تەماشاکردنی تابلۆگەلێك کە گوێیەکان نەیبیستوون و، چاوەکان نەیاندیتوون و، ڕۆحەکانیش لە وێناکردنیان دەستەوسانن، لە هۆش خۆیان دەچن...



لەسایەی خەونەکاندایە کە هەست بە دوو خاسیەتی وەك دڵ و بەسیرەتمان دەکەین و، لە زیندانی سێ ڕەهەندیی جەستە ڕزگارمان دەبێت. لەڕاستیدا لای ڕۆحانێکی بەرز کە لەگەڵ حەقیقەتدا ناوێتەبوون، بۆ موشاهەدەکردنی جیهانەکانی نەودیو پێویست بە خەونەکان ناکات. نەوان هەموو دەم و ساتێك نەوێ و نێرە پێکەوە دەبینن و، لەگەڵ جوانییەکانی نەبەدییەتدا بە مەست و خوماری دەژین. نەوەندە هەیە نەم دەرگایە بۆ هەموو کەسێك کراوە نییە؛ نەوانەش کە بۆیان کراوەتەوە، تەنها دوای هەوڵ و کۆششێکی جدی و نەزموونی سەختی ڕۆحی بۆیان مسۆگەربووە.



ئەوانەی کە زیهنی مرۆڤیان وەکو زیندانی شتە پیس و بۆگەنەکان دیوە، یان لە دونیای تەماوی هەستە ناژملییەکانیاندا لێکدانەوەیان بۆ ئەم بابەتە کردووە، خەونەکانیان کە بریتین لە جێگایەک بۆ هەزار و یەک شتە و سروەی ئیلهامەکان وەک کەرنەڤالی لرخەلرخی نەستی نائاگا دیتووە و هەر بەم جۆرەش پیشانی کەسانی تریان داوە. وەلێ ئەو داهێنەرانەی کە یەکەمین ئیلهامیان لە خەونەوە وەرگرتووە و هەزاران دۆستی خواش، هەمیشە بەردەوامدەبن لە منەتباربوون بەرامبەر بەم هەرێمە بەپیت و بەرەکەتەی جیهانی میسال.



ئەو مەزنترین ڕۆحەی کە جیهانی نوقمی ڕووناکی کردووە (عَلَيهِ أفضَلُ الصَّلاةِ وأتَمُّ التَّسليم)، تەنانەت کاتێکیش کە لەو دەریایانەی مەعریفەتدا گەشتی دەکرد کە بەهۆی چارۆکەی خەونەکانەوە بە ڕوویاندا کرابووەوە، جاروبار بۆ ئەم یەکەم پلە پیرۆزە دەگەڕایەوە و. چەندین جار ئاماژەی بەم شەتلگەیە کە بریتییە لە بەشێک لە چل و ئەوەندە بەشی پێغەمبەرێتی کردووە.

# عەشق

عەشق، یەکێکە لە ڕازنامێزترینی ئەو لوتفانەی کە لەلایەن ڕەحمەتی بێسنووری خواوە بە ئادەمیزاد بەخشراوە. عەشق، وەکو ناوك و تۆو، لە هەموو تاکێکدا بوونی هەیە. بەئەندازەی گونجاویی هەلومەرجەکان ئەو ناوك و تۆوە، بەوێنەی درەختەکان لق و پەل دەهاوێت؛ وەکو گوڵان شکۆفە دەکات؛ چەشنی میوەکانیش بە کۆکردنەوەی سەرەتا و کۆتایی، زنجیرەی پێگەیشتن کامڵدەکات.

***

عەشق، وەکو هەستێك، لە دەلاقەکانی وەك چاو و دڵ و گوێوە دەڕژێتە ناو جیهانەکانی ناوەوەی ئادەمیزاد؛ هەتا کاتی بەیەکگەیشتنیش، وەکو بەنداوێك پڕدەبێت و، وەکو هەرەسی بەفر هەتا بێت زۆر دەبێت و چەشنی بڵێسەیەك هەموو بوونی مرۆڤ دەگرێتەوە. کاتێکیش بە بەیەکگەیشتن کۆتایی پێهات، هەموو شتێك ڕوو لە نیشتنەوە دەکات؛ ئاگر دەکوژێتەوە، بەنداو خاڵی دەبێتەوە، هەرەسی بەفریش دەتوێتەوە و نامێنێت...

***

عەشق کە لە کاتی لەدایکبوونەوە وەکو مانا و ناوەڕۆك و تۆوێك لایەنێکی گرنگی هەموو ڕۆحێك پێکدەهێنێت، ئەو دەمە تۆن و ڕەنگی ڕاستەقینەی دەردەکەوێت کە دەگۆڕێت بۆ عەشقی ڕاستەقینە؛ کاتێکیش گۆڕا ئەبەدییەت بەدەستدەهێنێت و، لە بەردەرگای ویسالدا دەگۆڕێت بە چێژ و لەزەتێکی پەتی.



ئەو لوتکەیەی کە لە مرۆڤدا کراوەیە بە ڕووی تەجەللییە خواییەکاندا، دڵە. دیارترین نیشانەی مەزهەرییەتی دڵان بۆ ئەم تەجەللییانە و لە ئەنجامیشدا بۆ خۆشەویستیی خوایی، عەشق و ئیشتیاقی ناو ئەم سینانەیە بەرامبەر بە بەدیهێنەری مەزن.



خێراترین و کورتترین و سەلامەتترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە ئاسۆی مرۆڤی کامڵ، ڕێگای عەشقە. ڕێگاگەلێك کە بە ڕووی عەشق و ئیشتیاقدا کراوە نەبن، گەیشتنیان بەو ئاسۆیە هەتا بڵێیت زەحمەتە. دەتوانرێت بوترێت لە بابەتی گەیشتن بە حەقیقەتدا، جگە لە ڕێگای ''لاوازی و هەژاری و شەوق و شوکر''.



عەشق، لە ڕێگای دۆزینەوەی بەهەشتی لەدەستدراودا، بوراقێکە کە لەلایەن خوای گەورەوە بە دیاری پێمان بەخشراوە. هەتا ئێستا هیچ کەسێك لەوانەی سواری ئەم بوراقە بوون، لە نیوەی ڕێدا بەجێنەماون. لەوانەشیدا دەگونجێت کەسانێکی وەهاش ببینرێن کە تەنانەت لەسەر پشتی ئەم بوراقە ئاسمانییە، هاوڕێ لەگەڵ شەتەحات و نەشوەی سەرخۆشیدا، بە کەناری ئەم ڕێیەدا ڕێدەکەن. بەڵام ئەمە بەتەواوەتی وابەستی عەیاری پەیوەندیی ئەوانە بە خوای گەورەوە.



عەشق، چونکە مرۆڤی بەتەواوەتی سووتاندووە و کردوویەتی بە

خۆڵەمێش، ئیدی لەوەودوا نە ئاگرەکانی دونیا و نە ئاگرەکانی عوقبا نایسووتێنن و ناشتوانن بیسووتێنن. چونکە بەرمەبنای ئەوەی کە ناکرێت دوو سەلامەتی و دوو ترس و، دوو ئیشتیاق و دوو ژان لە یەك کاتدا لە مرۆڤێکدا جێیان ببێتەوە، ئەوانەی کە بەدرێژایی ژیانیان سینەیان بە ڕووی بڵێسەکانی ئاگری عەشقدا کردووەتەوە و لە دونیای ناوەوەیاندا لەگەڵ ئاگرە دۆزەخییەکاندا دەستەویەخە بوونەتەوە، بۆ دووەم جار هەمان ئازار و هەمان ژانیان تووشنایەتەوە...

***

عەشق کە بوونی خود لە بیری مرۆڤ دەباتەوە و لە گەڵ بوونی یاردا ئاوێتەی دەکات، بریتییە لە ئاونیشانی خواستنی مەعشوق لەلایەن دڵەوە دوور لە هەموو جۆرە کین و ڕق و ئیلییەك و، توانەوەی لە ویست و ئارەزووەکانیدا. پێموایە موراد لە مرۆڤێتیش هەر ئەمەیە.

***

لە مەشرەبی عەشقدا ڕوانینی چاوی عاشق بۆ شتانی دیکەی جگە لە یار حەرامە و، ئەنجامدانی ئەم حەرامەش بە مانای مەرگی عەشق دێت. ژیانی عەشق، بەئەندازەی ئەوە بەردەوامدەبێت کە خاوەنەکەی هەرچییەك لە چواردەوریدا هەستپێدەکات، بە ناو و نیشانی یار و، پەسنی جوانیی ئەو و داستانی کەماڵی ئەو بزانێت، ئەگینا دەکوژێتەوە و دەمرێت...

***

عاشق ناتوانێت لە هیچ بابەتێکدا بیر لە دژایەتیکردنی مەعشوقەکەی بکاتەوە. بەتایبەت هەرگیز نایەوێت شتانی تر پێشی دڵدارەکەی بکەونەوە و دووچاری لەبیرکرانی بکەن. بگرە هەر وتەیەك باسی ئەو نەکات بە پووچ و

بێسوود ئەژماردەکات، هەر کارێکیش پەیوەندیی بە ئەوەوە نەبێت، بە بێوەفایی و نانکوێری دەزانێت بەرامبەر بە ئەو.

***

عەشق، بریتییە لە حالەتی پەیوەندیی دڵ و، مەیلی ئیرادە و، پاکژبوونەوەی هەستەکان لە ئەغیار و، جگە لە خەون و خولیای مەعشوق هەستنەکردنی لەتیفەکانی مرۆڤ بە هیچ شتێکی دی. ئیدی لە هەموو ڕەفتارێکی عاشقدا مانا و واتایەک دەربارەی خۆشەویست دەدرەوشێتەوە؛ دڵی هاوڕێ لەگەڵ ئیشتیاقی ئەودا لێدەدات، زمانی هەمیشە چەپەی یادی ئەوی لێ هەڵدەوەرێت، چاوەکانیشی هەمیشە لەگەڵ خەیاڵی ئەودا دەکرێنەوە و دادەخرێن...

***

عاشق، لە بای هەڵکردوو و، نمەی باران و، هاژەی ڕووبار و، شنەی دارستان و، گزنگی سپی و، شەوی تاریکدا هەردەم هەست بە بۆنی خۆشەویستەکەی دەکات و زیندوودەبێتەوە؛ بە بینینی درەوشانەوەی جوانییەکانی ئەو لە چواردەوریدا دەجۆشێت؛ لە هەموو سروەیەکدا هەست بە نەفەسەکانی تایبەت بە ئەو دەکات و دڵخۆش دەبێت و، جاروبارێش بە هەستکردنی بە گلەییەکانی ئەو دەناڵێنێت...

***

ئەو عاشقانەی کە بە ئاسۆی نیشانەکانی تایبەت بە مەعشوقدا چاویان هەڵهێناوە، هاوڕێ لەگەڵ خوێنی سووری سەر لێو و، تۆفانی گڕگرتووی سینەیاندا، خۆیان لەناو بازنەیەکی ئاگریندا دەبیننەوە، ئیدی حەزناکەن هەرگیز ئەم دۆزەخە بەچێژە بەجێبهێڵن.

***

ئەژمارکردنی عەشق بە خۆشەویستیی شەهوانیی خراپەکاران هەڵەیە و نیشانەی نەزانین و نەناسینی عەشقی ڕاستەقینەیە. لە ڕاستیدا هەندێك جاریش عەشقی مەجازی گۆڕاوە بۆ عەشقی ڕاستەقینە. بەڵام ئەمە هەرگیز بە مانای ئەوە نایەت کە عەشقی مەجازی لە خۆیدا خاوەنی نرخ و بەهایە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئاماژە بە کەموکورتی و سنوورداری و فانیبوونی ئەو دەکات.

***

عاشقانی ڕاستەقینە بەهۆی ئەو تای عەشقەی کە لێیان هاتووە، دونیای ناوەوەیان هەمیشە وەك بورکانێك لە نرکە و ناڵە و دووکەڵدایە. لە دیدی ئەوانەدا کە هەست بەمە دەکەن، ناڵەی ئەوان وەك تۆپەڵی ئاگرینی فڕێدراوی بورکانەکان وەهایە؛ بەر هەر کونیەك بکەون دەیسووتێنن و لەناوی دەبەن و ئاگری تێدا بەرپادەکەن.

***

گوزارشتکردن لە عەشق بەهۆی وشە و وتەوە زۆر زەحمەتە و تەنانەت نەستەمیشە. لەبەر ئەم هۆیەیە کە زۆربەی ئەو شتانەی کە دەربارەی عەشق وتراون جگە لە ڕەنگدانەوە و شوێنەوارەکانی ئەو لە جیهانی دەرەوەدا هیچی دی نین. چونکە عەشق "حاڵ"ە و ئەو زمانەش کە دەتوانێت گوزارشتی لێبکات تەنها خودی عاشقە.

***

عاشق سەرمەستێکی وەهایە کە خۆشەویستیی خوای کردووە بە مەزهەبی

خۆی و، ژیانی خۆی بۆ سەرسامی و حەیرانبوون بە یار و منەتباری و شوکرانەبژێری یار تەرخانکردووە. پێدەچێت تەنها بە صوری قیامەتیش بێتەوە هۆشی خۆی.

***

عاشق وەکو گڕکان وایە، هەردەم لەنار خۆیدا دەکوڵێت.

***

ئەگەر تاکە شتێك هەبێت کە ئازاری فەنابوون بسڕێتەوە و، ژانی ئاگری ئەو ڕۆحانە خامۆش بکات کە لەگەڵ خەزاندا هەڵدەستن و دادەنیشن، ئەوە عەشقی حەقیقییە. بەڵێ، تاکە چارەسەر و دەرمانێك بۆ زامی چەندین ساڵەمان و، ترس و ئەندێشەکانمان و، قەیران و ناڕەحەتییەکانمان و، ئەو نەخۆشییانەمان کە ڕاماندەزانی هەرگیز بزمەتە نابن، تەنها عەشقە.

***

کاتێك هەوڵدەدرێت ئەوەکان بەهۆی زانست و عیرفان و کلتووری ئەم ڕۆژگارەوە زیندوویکرێنەوە، ئەگەر بەئەندازەیەکی کەمیش بێت، پزیسکێك لە عەشق لە دڵیان نەهاوێژرێت، هەردەم بە کەموکورتی و ناتەواوی دەمێننەوە و، هەرگیز ناتوانن جیسمانییەتی خۆیان تێبپەڕێنن.

# ژن

ژن، سەبارەت بە پەروەردە و فێرکردنی منداڵان و، ڕێکوپێکی و ئارامی و ئاسوودەیی خێزان، یەکەم مامۆستای قوتابخانەی مرۆڤێتییە. لەو باوەڕەدایین لەم ڕۆژگارەدا کە خەڵکی بەدوای هەندێك پلە و پێگەدا دەگەڕێن بۆ پێناسەکردنی ژن، جارێکی دی بیرخستنەوەی ئەم پێگە نازارەی کە دەستی قودرەت بە ژنی بەخشیوە، ڕێ لە هەندێك گەڕانی نزولی دەگرێت.



ماڵێك ژنێکی بەناموس و خاوەن پەروەردەی باشی تێدا بێت کە پەیوەندییەکی بەتینی بە هێلانەکەیەوە هەیە، گۆشەیەکە لە گۆشەکانی بەهەشت و، ئەو دەنگانەش کە تێیدا دەبیسترێن، لەگەڵ نەفەسی حۆری و غیلمان و هاژەی کەوسەردا هیچ جیاوازییەکیان نییە.



مرۆڤ کاتێك ژنێك دەبینێت کە لەژێر باری جوانیی ڕواڵەتیدا پلیشاوەتەوە، بە خۆی دەڵێت "داخۆ هەمان گرنگیش بە ناموس و پاکیزەیی و فەزیلەت دەدات کە بە جوانیی ناوەکیی نافرەت هەژماردەکرێن؟"



ئەو شتەی کە ژن لە فریشتەکانیش بەرزتر و مەزنتر دەکات و دەیکات بە ئەلماسێکی بێوێنە، قووڵیی ناخ و پاکیزەیی و ویقاریەتی.

ژنێك كە قسە لەسەر پاكیزەییەكەی بكرێت پارەیەكی قەڵبە و، ئەگەر بێویقاریش بێت بووكەڵەیەكی گاڵتەپێكراوە. لە كەشوهەوایەكدا كە ئەم جۆرە كەسانەی تێدان، مەحاڵە باس لە خێزانێكی تەندروست و نەوەیەكی تەندروست بكرێت.

***

ژنێك كە لەسەر ئاستی جیهانی ناوەوەی چاوی بە ڕووی فەزیلەتدا كرابێتەوە، لە ماڵەكەیدا لە سورمییایەكی كریستاڵیی دەچێت. لەگەڵ هەر جووڵانەوەیەكیدا، هەموو لایەكی ماڵەكە بە ڕەنگەكانی دەبریسكێنەوە. هەرچی ئەو بەدبەختەیشە كە جلوبەرگی ژنی لەبەردایە و بەڵام لە دونیای ڕۆحی خۆیدا تەسلیمی بیرە تاریك و ڕەشەكان بووە، سەرچاوەیەكی دووكەڵ و ژەنگی وەهایە بە هەر جێیەك بگات پیسی دەكات.

***

تاكە كتێبێك كە هەمیشە ژن بیخوێنێتەوە و لە دەستی نەكەوێتە خوار، كتێبی پەروەردەی كۆمەڵایەتییە؛ هەرچەندە ناتوانرێت بوترێت كە هەتا ئێستا بەتەواوەتی و بەكاملی نووسراوەتەوە.

***

پێشینان دەیانوت "دەرزیی دەستی ژن وەكو شمشێری دەستی جەنگاوەر وایە." ڕاستییەكەی من هیچ زیادەڕۆییەك لەم قسەیەدا نابینم.

***

ئەو سەردەم و ڕۆژگارانەی كە تیایاندا ژن كەرستەی چێژ و، بابەتی ڕابواردن و، كاڵای ڕێكلام بووە هەرگیز كەم نەبوون. بەڵام سوپاس بۆ خوا،

هەموو ئەم سەردەم و ڕۆژگارە تاریکانە بوون بە سەرمایەك بۆ زیندووبوونەوە و نوێبوونەوە و دۆزینەوەی ناخ و ناوەرۆکی خۆی.



پێشینان بە کوڕیان دەوت "مەخدوم" و بە کچیشیان دەوت "کەریمە"، ئەم وشەیە کە واتای گلێنەی چاویش دەگەیەنێت، گوزارشت لە شتێکی زۆر بەنرخ دەکات کە بەئەندازەی بەنرخییەکەی پێویستە و، بەقەدەر پێویستییەکەشی ناسك و نیانە.



دەڵێن "دامێنت لە تەپوتۆز بپارێزە". ئەگەر ئەمە وابێت، دەبێت چەند گرنگی و بایەخ بە پاراستنی ژن بدرێت کە گلێنەی چاوە؟!



ژنی خاوەن فەزیلەت هەروەك جوانی و ئارایشتەکەی ناموس و پاکیزەییەکەیەتی، ئەو لایەنەش کە پێویستە لە هەموو شتێکی تری بەرز بنرخێنێت و بەسەرساسییەوە پێشوازی لێبکرێت، پەروەردەی کۆمەلایەتی و ڕاستگۆییەتی بەرامبەر بە هاوسەرەکەی.



ژنی باش ئەو ژنەیە کە حیکمەت لەسەر زاریەتی و، وردی و ناسکی و نیانی لە ڕۆحیدایە و، لە ڕەفتارەکانیشیدا ڕێز و حورمەت بەرامبەر بە هەموو کەسێك دەبینرێت. بەجۆرێك، ئەو ڕوانینە ناشایانەی کە هەست بەم لایەنە پیرۆزەی ئەو دەکەن، دەتوانن هێلنجی ناوەکی خۆیان کە لە سروشتی مرۆییەوە سەرچاوەی گرتووە، لەسایەی ئەواندا بگۆڕن بە عیبرەت و تێڕامان.



ژنێك كە لەسەر ئاستی ژیانی جەستە گەشەی كردبێت، بەڵام نەیتوانیبێت پەرە بە تۆوەكانی دڵ و ڕۆحی بدات و شكۆفەیان پێ بكات، ئەگەر ماوەیەكی دیاریكراو لەو گوڵانەش بچێت كە لە یەخە دەدرێن، بەحەتمی سیس و زەرد هەڵدەگەڕێت و، یەك لە دوای یەك پەڕەكانی هەڵدەوەرێن و دەكەوێتە ژێرپێ. ئای ئەمەش چارەنووسێكی چەند خەمناكە بۆ ئەوانەی كە ڕێگای ئەبەدییەتیان نەدیوەتەوە!



ژن، هەتا ئەو كاتەی فریودەدرێت و دەخرێتە ناو زۆزنگاوەكانەوە، گەوهەرێكی بەرز و بەڕێزە. هێشتا هیوای ئەوەمان لەدەستنەداوە كە لەلایەن ئەوە بەختەوەرەكانی داهاتووەوە كە چاویان بە ڕووی زانست و عیرفان و حەقیقەتدا هەڵهێناوە نرخ و بەهای بەرز و بەڕێزی خۆی پێبدرێت و وەك گلێنەی چاو مامەڵەی لەگەڵ بكرێت.



ژنی ئێمە، پتەوترین بەردی بناغەی شەرەفی میللی و نەجیبیشمانە. بەشی ئەو لە بنیاتنانی ڕابردووی دووروودرێژ و شكۆدارماندا، هیچی لە بەشی ئەو موجاهیدانەمان كەمتر نییە كە لەگەڵ دوژمندا دەستەویەخە جەنگاون.



زۆربەی ئەوانەی بانگەشەی ماف و ئازادیی ژنان دەكەن، جگە لە خرۆشاندنی حەزە جەستەییەكانی و خەنجەردان لە ڕۆحی، هیچی تر ناكەن.

***

ژنێك كە لە ڕۆحیدا بە كاملی گەیشتبێت، لەسایەی ئەو ڕۆڵە چاكانەدا كە پێی گەیاندوون و لەدوای خۆی جێی هێشتوون، هەمیشە هێلانەكەی بۆنی بخوردانێكی لێدێت و، ئاسوودەیی و خۆشبەختی بە دڵان دەبەخشێت. ژینگەیەكی ناخیرەتیی لەم جۆرەی كە ئەم جۆرە بۆن و بەرامانەی تێدایە، باخچەیەكی تەواوەتیی بەهەشتە و لەسەروو هەموو جۆرە پێناسە و وەسفێكەوەیە.

***

ژنێك كە دڵی بە نووری ئیمان و، سەریشی بە زانست و پەروەردەی كۆمەڵایەتی ڕۆشنكردبێتەوە، وەك ئەوەی هەموو ڕۆژێك سەرلەنوێ ماڵەكەی بنیاتبنێتەوە، ڕەهەندی نوێی جوانیی بۆ زیاددەكات. هەرچی ئەو هەرزە و نەفامانەیشە كە خۆیان ناناسن، ماڵ و هێلانە بنیاتنراوەكانیش خاپووردەكەن و، وەك گۆڕێكی تەنگ و تاریان لێدەكەن.

***

ژن، هەروەك قاپی خواردن و، پارچە كانزایەكی بێنرخ نییە، جێگەكەشی چێشتخانە و شوێنی هەڵگرتنی پارچەكانزاكان نییە. ئەو، مرواریییەكی نایابە و، بێ هیچ گومانێك پێویستە لە سەدەفی تایبەت بە مرواریدا بپارێزرێت.

***

ژن، لە بابەتی ناسكی و نەرمونیانی و هەستیاریدا خاوەنی پێگەیەكی ناوازەیە، ئەو، هاوڕێ لەگەڵ ئەم تایبەتمەندییانەیدا، تەنها لە حاڵەتی مانەوەیدا لە چوارچێوەی سروشت و فیترەتی تایبەت بە خۆیدا دەتوانێت سوود بە خێزانەكەی و كۆمەڵگاكەی بگەیەنێت.



هەموو ئەو پێشنیارانەی کە هەتا ئێستا فێمینیستەکان لەپێناو ئافرەتدا خستوویانەتە گۆڕێ، ئافرەت سووک و کەمبایەخ دەکەن و، قەبە و ڕەق و ناشرینی دەکەن و، سروشت و فیترەتی دەشێوێنن. ئەمە لەحاڵێکدا کە ژن لە زنجیرەی بووندا ئەڵقەیەکی زۆر گرنگە و، گرنگترین لایەنی ئەویش ڕێزگرتنیەتی لە سنوور و چوارچێوەی فیترەت و سروشتی خۆی.

## سروشت

سروشت، بەگشتی بە مانای تێکڕای بوون و تایبەتمەندییەکانی و ئەو خەسڵەتانەی دێت کە لە بەدیهاتنیدا هەن. لە مرۆڤیشدا بە واتای خوو و ڕەوشت و میزاج و کەسایەتی دێت. سروشت، هەڵوێستە لەسەر هەر شێوە و شکڵێکی بکرێت، بریتییە لە نەخشێك کە بەرهەمی دەستی قودرەتی ڕەهایە و، لە دەستی توانست و هێزی بەدیهێنەردا یاسایە و، کتێبێکی ڕەهایە کە سەربوردەی حیکمەتەکانی ئەو دەڵێتەوە. سروشتیش بەوێنەی ماددە، بێهەست و بێشعوورە. لەم ڕووەوە ئەو، هەم بە زمانی هەموو ئەو بوونەوەرانەی کە ڕۆژانە لە سینەیدا بەدیدەهێنرێن و، هەم بە زمانی هەموو ئەو بەدیهاتووانەش کە دروستبوونیان پێویستی بە شعوور و ئیرادە و ئیدراک و پلانی زانستی هەیە، هەژاری و بێتوانایی و دەستەوسانیی خۆی ڕادەگەیەنێت. واتە ئەو بەبەدەم هاوار بۆ زانستێکی گشتگیر و، توانستێکی شکۆمەند و ئیرادەیەك دەکات لە پشتی خۆیەوە کە زیرەکییەکان سەرسام دەکات.



مادەم سروشت بریتییە لە خەسڵەتەکانی ماددە و ئەو تایبەتمەندییانەی کە لە بەدیهاتنیدا هەن، کەواتە ناگرێت بوونی لەپێش بوونی ئەو ماددەیەوە بێت کە قەرزاریەتی. کەواتە گەڕاندنەوەی بوونەوەران و ڕووداوەکان بۆ سەر ئەو و هەوڵدان بۆ شیکردنەوەیان لەڕێگەی ئەوەوە، جگە لە خەڵەتان و خەڵەتاندن هیچی تر نییە.



ئەمڕۆ تەنانەت ئەوانەش کە کەمترین سەرقاڵییان بە زانستە سروشتییەکانەوە هەیە، زۆریاش دەزانن کە سروشت هێزێکی کەڕ و کوێرە و ناتوانێت هیچ شتێك بەدیبهێنێت. مادەم ڕاستی ئەمەیە، کەواتە هەوڵدان بۆ دانانی ئەو لە جێگەی هێزی بەدیهێنەردا، دەبێت جگە لە کۆنەپەرستیی کوفر شتێکی دیکە نەبێت.



نیشاندانی سروشت بەشێوەیەك کە جیاواز بێت لە بوونی ڕاستەقینەی خۆی و ناساندنی بە نەوەکان وەك ئەوەی کە هێزێکی داهێنەر و بەدیهێنەر بێت لە کاتێکدا کە زۆر بەڕوونی ماهییەتی سروشت دەزانرێت —دژایەتیکردنی زانستەکانە و، بە بێڕێزیکردن دادەنرێت بەرامبەر بەو شتانەی کە لەم پێشانگا سەرسوڕهێنەر و ئارازمەی دونیادا نمایشکراون و، لەڕاستیدا هەریەکەیان بریتین لە بەرهەمێکی هونەریی ئاوازە.



ئەگەر سروشت خودی بوون و بوونەوەران بێت، نازانم داخۆ ئەوانەی

دەڵێن "سروشت بەدیهێناوە" ئاگاداری ئەوەن کە بەم قسەیەیان لەڕاستیدا دەڵێن "بوون خۆی خۆی بەدیهێناوە"؟! خۆ ئەگەر مەبەستیشیان لە سروشت خوو و سیفەت و تایبەتمەندی و یاسا و ڕێسا و شتانی لەم جۆرە بێت، ئایا پێویستناکات ڕوونی بکەنەوە چۆن سروشت شتان و ڕووداوەکانی بەدیهێناوە لە کاتێکدا کە سروشت کێڵگە و بێشکەیەکە بۆ ئەوان؟!

## بەسیرەت

بەسیرەت بریتییە لە بناغەیەك بۆ زانین و ناسین و هەڵسەنگاندن و هەستپێکردن و بینین بەهۆی زانست و ئەزموون و نووری فیراسەتەوە و، بە تێگەیشتن و پەیبردنێکی تەواو و کامڵ دەوترێت. بەم مانایە، مرۆڤی خاوەن بەسیرەت ئەگەر لەهەمان کاتدا کراوەش بێت بە ڕووی جیهانەکانی ئەودیودا، ئیدی ئەو پاڵەوانێکی بواری حەقیقەتی وەهایە کە عەزمی بوون بە مرۆڤی کامڵی کردووە و، پاڵەوانێکی کایەی مەعنەوییەتە.

•••

عەقڵ، سەرچاوەیەکی گرنگی زانستە، بەسیرەتیش کانگایەکی جددیی عیرفانە. کەسێك عەقڵی هەبێت و بەسیرەتی نەبێت، ئەگەر زۆر شت بزانێت و لە زۆر شتیش تێبگات، زەحمەتە بەو شتانەی کە دەیزانێت بە جێگایەك بگات، بگرە ئەستەمیشە.

•••

ئەگەر بەسیرەت بریتی بێت لە پەیبردن بە شتێك وەك خۆی یان نزیك لە خۆی، ئەوا لەوانەیە هەموو ژیر و خاوەن عەقڵێك بە خاوەن بەسیرەت دانەنرێت.

***

لە عەقڵێکدا کە خاوەنی بەسیرەت نەبێت زوو زوو گومان و دوودڵی و ناجێگیری دەردەکەوێت، لە بەرامبەردا ژینگەی خاوەن بەسیرەت هەمیشە تێیدا گەرموگوڕی و نەرمی و دامەزراوی و سەلامەتی تێیدا باڵادەستە.

***

عەقڵ و فیکر، کۆتا ئاستی پەیبردن و تێگەیشتنی دەماغە؛ هەرچی بەسیرەتیشە، یەکەم پلەی نیگاکی ڕۆحە. لوتکەی بەسیرەتیش حیکمەتە کە قورئانی پیرۆز بە ئایەتی "کێ حیکمەتی پێبەخشرابێت، بێگومان خێروبێرێکی زۆری پێدراوە"، ئاماژە بۆ ئەم حەقیقەتە دەکات.

***

ئەوانەی تەنها بە چاو تەماشای بوون دەکەن، بە ئەندازەی توانای بینین و دەوروبەری چاو لێی تێدەگەن. وەلێ ئەوانەی کە شتان بەهێزی بەسیرەتەوە شیتەڵ دەکەن، بەوێنەی گەڕانی هەنگ بەسەر گوڵاندا و کۆکردنەوەی هەنگوین لێیان، لە هەموو شتێکدا ماناگەلی شەکر و شەربەت ئاسا هەڵدەگوزن.

***

چاو، شکڵ و شێوە و سیما و بەژن و باڵای ئەو کەسانە دەبینێت کە تەماشایان دەکات. بەسیرەت، لەسەروو ئەمانەشەوە، هەست بە شتانی وەك ئەخلاق و ئەزیلەت و پلە و نرخی ڕۆحیش دەکات.



چاوەکان لایەنی دەرەکی و ماددیی شتان و ڕووداوەکان دەبینن، بەڵام بەسیرەت دیوی ناوەوە و ناوەڕۆك و سرود و ئامانج و حیکمەتی شتانیش دەبینێت و دەیانناسێت و تێیان دەگات.



بەسیرەت، هەروەك بە مانای عەقڵ نایەت، واتای بیرکردنەوەش ناگەیەنێت. هەروەك بیرکردنەوە و تێڕامان خودی عەقڵ و بەرهەمەکانی عەقڵ تێدەپەڕێنێت، بەسیرەتیش بەهرە و مەلەکەیەکی خواییە و زۆر لەپێش بیرکردنەوەوەیە.



ئەو شتەی مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە، شعوور و بەسیرەت و، پاشان مەزهەرییەتی ئیلهام و حیکمەتە. ئەوانەی لەم تایبەتمەندییانە بێبەشن، شکڵ و شێوەیان هەرچۆنێك بێت. مانای وایە نەیانتوانیوە بگەن بەو دوایین حاڵەی کە پێویستە پێی بگەن.

# هەست

هەست، بریتییە لە پەیبردن بەو شتانەی کە دەکەونە چوارچێوەی هەستکردنی مرۆڤەوە لە ڕێی بەهۆی هەستەوەرە نارەکی و دەرەکییەکانیەوە. لەم ڕوانگەیەوە ئەو کەسەی لە یەك کاتدا هەست بە شتێك یان چەند شتێك بکات پێی دەوترێت "هەستیار".

***

عەقڵ هەستکردنی مێشکە و، ویژدانیش هەستکردنی ڕۆحە. ئەگەر یەکەمیان بە "زانین" پێناسەبکەین؛ وا گونجاوە دووهەمیان بە "هەست" ناوزەدبکەین. لەبەر ئەم هۆکارە، ئەوانەی عەقڵیان لەکارکەوتوو و ویژدانیان مردووە، هەرگیز نە هەست بە بوون دەکەن و، نە زانیاریشیان سەبارەت بەو ڕووداوانە هەیە کە لەناویدا دەگوزەرێن.

***

هەست، لە ڕوانگەی حیکمەتەوە ئەو ویژدانەیە کە میکانیزمی ئیدراکی ڕاستەوخۆی ڕۆحە. لەم ڕووەوە، مرۆڤی بێهەست بێویژدانە و، مرۆڤی بێویژدانیش بێهەستە.

***

هەست، بە مانایەکی تایبەتیتر، بریتییە لە هەستکردنێکی نارەکی بە چاك و جوان و، خراپ و ناشرین و، ڕێگەیەکی لەم جۆرەش دەتوانێت چەندین تایبەتمەندیی مرۆیی بەدەربخات. بۆ نموونە "کاتێك دوژمنەکەمان

بەدیل دەگرین، دەیکوژین یان لێی خۆشدەبین؟ کاتێك یەکێك ناموسمان لەکەداردەکات، ئێمەش ناموسی لەکەداردەکەین یان مرۆڤانە هەڵسوکەوت دەکەین؟" ئێمە لە ڕێگەی ئەو هەستەوە کە لە سەرەوە باسمان کرد، لەنێوان ئەم دوو لایەنەدا لایەکیان هەڵدەبژێرین.

***

هەست، بەهۆی حیکمەتەوە دەتوانرێت پەروەردەبکرێت و گەشەی پێبدرێت. بەلام فەلسەفەی ماددەپەرستی دەیکوژێنێتەوە و کوێری دەکاتەوە. لەم ڕووەوە ئەوانەی هەموو بابەتێك بۆ عەقڵ دەگێڕنەوە، هەرگیز ناتوانن دونیای ڕۆشنی هەستەکان بناسن.

***

هەستی ڕاست، داخوازی هەستیارییەکی بێ ڕق و قین و بێ فرتوفێڵە. هەستیارییەکی تەواوەتی و ڕاستەقینەش لە هەستێکی تەواوەتی و ڕاستەقینەوە لەدایکدەبێت.

***

سەرجەم سەرکەوتنەکانی کەسانی بێهەست و بێویژدان سەرکەوتنی ناژیانین و بریتین لە زنجیرەیەك لە سووکی و ڕسوایی. هاربوونی جیسمانییەت و بەت بچڕاندنی نەفسانییەتیش، بە شکانی پەڕ و باڵی ڕۆح و ئیفلیجبوونی میکانیزمی ویژدان کۆتایی پێدێت.

***

ئەوانەی لە ویژدانیاندا هەست بە ئازار و ژانی ئەو بەلا و موسیبەتانە دەکەن کە بەسەر دین و نیشتمان و میللەتدا هاتوون، کۆمەڵێك ڕۆحی

بڵندی وەهان کە لەسەر ئاستی دونیای هەستەکانیان بێداربوونەتەوە و، لەپێناو ئەم بەها باڵایانەدا کە دڵیان پێیان داوە، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە سڵ لە بەختکردنی ژیانیان ناکەنەوە. هەرچی ئەوانەشە کە بێهەستن، ئەگەر زۆریش بڵێن دەربارەی فیداکاری، هێشتا توانای ئەوەیان نییە بچووکترینی ئەو شتانە جێبەجێبکەن کە دەیڵێن.

* * *

هەبوونی خەسڵەتەکانی وەك خەمخۆری بۆ کەسانی تر و، ژیان لەپێناویاندا و، هەستکردن بە چێژ و ئازارەکانیان لە مرۆڤدا کە هەریەکەیان بەهایەکی سەربەخۆن، لە بەهێزیی هەستی ڕۆحانیی ئەو کەسەوە سەرچاوەدەگرێت. لەوانەشدا کە بەتەواوەتی لەم هەستانە بێبەشن، نەك تەواوی ئەم خەسڵەتانە، بەڵکو ناتوانرێت تاکە دانەیەکیشیان نیشان بدرێت. هەرچی ئەو شتانەیشە کە بە ناوی فەزیلەت و جوامێرییەوە لە کەسانی لەم جۆرەدا دەردەکەون، تەنها لە ورتە ورتی وتنەوەی بەستەیەك دەچێت کە کەسانی تر شیعر و ئاوازیان بۆ داناوە.

* * *

بەرزبوونەوە و پێشکەوتنی هەر نەتەوەیەك وابەستەی یەکێتیی هەست و قووڵیی هەستیاریی تاکەکانیەتی. تەنها ئەو کەسانەی لە دونیای هەستەکانیاندا قووڵبوونەتەوە، ئامادەن بەبێ چاوترووکاندن لەپێناو بیر و باوەڕیاندا هەموو شتێکی خۆیان بەختبکەن. کاتێکیش کە بێچارە مانەوە، یان شێت دەبن یان نەخۆشدەکەون و دەمرن.

* * *

بەرزترین پلەی هەست ئەو تای تووڕەییمیە کە لە کاتی دەستدرێژیکردنە

ـەر بەها دینی و میللییەکاندا مرۆڤ دەگرێتەوە و، وەکو مەلاریا ڕۆحە هەستیارەکان دەتەنێت و ڕایان دەوەشێنێت. دەتوانین ناوی "پەرۆشی"یش لەمە بنێین.

***

پەرۆشی، بریتییە لە نازار و ژان و کەفوکوڵی ڕۆحێك لە دەمی زیڕاوژووربوونی بەها بەرز و باڵاکان و، دیارترین خەسڵەتە بۆ جیاکردنەوەی مرۆڤی ڕاستەقینە لەو بوونەوەرانەی کە بە شێوە و ڕواڵەت لە مرۆڤ دەچن.

هەر لە بەرزترین ڕۆحی سەر لوتکەوە (عَلَيهِ أَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) هەتا خاوەن ژان و نازارەکانی ئەمڕۆ، تێکڕای دەماغە ژانگرتووەکان کە هەریەکەیان بەرنەی بوخوردانێك دەسووتێن. بەهۆی ئەم تایەوە کە لێیان هاتووە، گاه لە چیاکاندا و، گاه لە ئەشکەوتەکاندا و، گاه لە گۆڕەکاندا هەستاون و دانیشتوون و، گەڕاون و بیریان کردووەتەوە و، ناڵاندوویانە و پشتیان شکاوە و قەدیان چەمیوەتەوە. وە بەڕای من ئەوانەی کە لە مێژوودا شکۆمەندترین سەردەمەکانیان بنیاتناوە، ئەم قارەمانانەی بواری هەست و پەرۆشین.

## بریسکەکانی حیکمەت یاخود فەلسەفە بە لای منەوە

دژایەتیکردنی زۆرینە هەڵەیە. ئەمە لە کاتێکدا ڕاستە کە زۆرینە لەسەر حەق بن. بەپێچەوانەوە ئەگەر زۆرینە لەسەر حەق نەبن، ڕێککەوتن لەگەڵیان و دژایەتینەکردنیان هەڵەیە. هەرروەك کەسێك کە پێچەوانەی ڕای کۆمەڵێك ئەندازیار دەربارەی ئەخۆشییەك دەجووڵێتەوە بە هەڵە دانانرێت. بەهەمان جۆر

وەرنەگرتنی ڕا و بۆچوونی پزیشکان لە بابەتی ئەندازە و بیناسازیدا کارێکی هەڵە نییە.

***

لاوازی و دەستەوسانی و تەنهایی مانای بێهێزی و بێتواناییی نییە. ئەوەتا چەندین کەسی خاوەن هێز و توانا و بەهرە هەن، چونکە بەباشی ناڕاستەنەکراون و بەکارنەهێنراون، لە دۆخی لاوازی و دەستەوسانیدان.

***

ئەوانەی ڕووناکییان لە خۆیانەوەیە، هەروەك هیچ تاریکییەك ناتوانێت ڕووناکییەکەیان بکوژێنێتەوە، هیچ ڕووناکییەکی دیکەش ناتوانێت بەسەریاندا زاڵ ببێت و بیانبەزێنێت. سەرچاوەیەکی ڕووناکیی لەم جۆرە بەدرێژایی تەمەنی سروشتیی خۆی، سەرەڕای هەموو شتێك، دەگرێت و چواردەوری خۆی ڕۆشندەکاتەوە.

***

عەقڵ، سەبارەت بە کەسانێك کە خۆیان بە نیمان ناڕازێننەوە، ئامرازێکی شووم و بێزارکەرە.

***

هەروەك ئەو کەسەی تەنها دەبینێت و لاساییدەکاتەوە، هێندەی ئەو کەسە سەرکەوتوو نابێت کە دەزانێت و کارەکانیشی دەرەنجامی زانینن، بەهەمان جۆر ئەو کەسەش کە دەزانێت و کارەکانی دەرەنجامی زانینن هێندەی ئەو کەسە سەرکەوتوو نابێت کە لە ویژدانیدا هەستدەکات و کارەکانیشی بەرهەمی ویژدانن.

***

نەك تەنها بێیارمەتی، بەڵکو هەریەك لە نەبوونی زانست و بیر و هونەریش هەژارین. لەم ڕووەوە ئەو دەوڵەمەندانەی کە بێبەشن لە زانست و بیر و هونەر بە جۆرێك لە جۆرەکان بە هەژار دادەنرێن.

* * *

هەندێك جار چاویلەکە دەروازەی موشاهەدە و ئامرازە بۆ بینینی چاو، چاویش هەموو کاتێك بۆ عەقڵ و، عەقڵ بۆ بەسیرەت و، بەسیرەت بۆ ویژدان و، ویژدانیش بۆ ڕۆح.

* * *

ئەو کەسەی لە شێتخانەدا حاڵی لە هەموو کەسێکی تر شایانی بەزەییە کەسی عاقڵە. ئەگەر شێتیش بێتە ناو ئێمەوە، شایانی بەزەییە. هەموان شێتن، تەنها جۆری شێتییەکە جیاوازە.

* * *

مرۆڤایەتی درەختێکە و نەتەوەکانیش لق و پەلی ئەو درەختەن.. ڕووداوەکان کە لە ڕەشەبای بەهێز دەچن، بەئەندازەی هێز و توندییان لق و پەلەکان دەدەن بەیەکدا. بێگومان زیانەکەشی هەر بۆ درەختەکە دەبێت. پێمچێت مانای وتەی "هەرکەسێك هەرچییەك بکات لەڕاستیدا بە خۆی دەکات". هەر ئەمە بێتە.

* * *

شەوان وەکو کۆمەڵێك مەیدانی کراوەن وان بۆ پێگەیشتن و گەشەکردنی مرۆڤ و، ئامادەبوونی بەختەوەریی ئادەمیزاد. هزر و بەرهەمە مەزنەکان هەردەم لەنێو ئەو مندالدانە تاریکەدا پێگەیشتوون و، پێشکەش بە خزمەتی مرۆڤایەتی کراون.

* * *

هەمیشە ئەوانەی کە بۆ گەشتی ئەودیو ئاسمانەکان بانگهێشت کراون، لەوانەدا هەڵبژێرراون کە گزنگی بەیانیان کەوتوونەتە ڕێ.

* * *

گەدە، ئەو خۆراکانە دەڕژێتە دەرەوە کە هەرس نەبووبن و بێسوود بن؛ پاشان تف لە نێوچاویان دەکات. کات و مێژووش هەمان شت بەرامبەر بە کەسانی بێسوود دەکات.

* * *

ژەنگ دوژمنی ئاسنە و، قورقوشم هی ئەڵماس و، هەرزەییش هی ڕۆح. ئەمڕۆش نەبێت بێگومان سبەی، دەیڕزێنێت و لەناوی دەبات.

* * *

هەموو زەردێك زێڕ و، هەموو درەوشاوەیەك ڕووناکی و، هەموو شتێکی بەخوڕیش ئاو نییە...

* * *

هەموو لافاوێك، بەرهەمی کۆمەڵێك دڵۆپەی وردی وەهایە کە گرنگی بە بوونیان نادرێت تا، لە ئەنجامدا دەگات بە ئاستێك کە هیچ شتێك ناتوانێت لەبەردەمیدا خۆی ڕابگرێت. بونیادی کۆمەڵگاکانیش هەمیشە بە ڕووی ئەم جۆرە لافاوانەدا کراون؛ جاری واهەیە ئەم لافاوانە ئەوانەش لەگەڵ خۆیان دەبەن کە دەیانەوێت خۆیان بکەن بە "بەنداو".

* * *

باسکردنی زانست و حەقیقەت بۆ نەزان و نەدیوەکان ئەگەر بە ئەندازەی

خەریکبوون لەگەڵ شتانەدا سەخت و زەحمەتیش بێت، باڵەوانانی ئیرشاد پێویستە بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ئەم ئەرکە ڕاپەڕێنن.

***

ترسناکترین بەڵا ئەو جۆرەیە کە بە خەندەوە بەرەو ڕووی مرۆڤ دێت.

***

لەبەرئەوەی هەموو کەسێك ناتوانێت لەهەمان ئاستدا لە حەقیقەتە ڕووتەکان تێبگات، ئەوا واز لە ڕێگای پەتی(تجرید) هێنراوە و، ڕێی بەرجەستەکردن(تشخیص) و نموونە هێنانەوە (تمثیل) گیراوەتەبەر.

***

هەمیشە سکاڵا لە دەست کات و شوێن دەکرێت. کەچی لەڕاستیدا تاوانباری سەرەکی نەزانییە. زەمانە و فەلەك بێتاوانن؛ بەڵام مرۆڤ زۆر سپڵە و زۆر نەزانە.

***

نیشتمان باخچەیە نەك دارستان. بۆ ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی پێویستە ئەمامی بەردار و گوڵ و گوڵزار بنێژرێت.

***

کەسێك باخچەکەی بۆ هێرشی گژوگیای زیانبەخش بەجێبهێڵێت و، پاشان سکاڵابکات و بڵێت "ئاخ فەلەك!". نازانم داخۆ دەبێت چی پێبوترێت؟!

***

چەندەها ڕێگای جوانی وەها هەن کە بەناو گوڵ و چیمەن و لالەزاردا

تێدەپەڕن. بەڵام ئەوسەریان لە بیابانی بکوژەوە دەردەچێت. چەندەها تووڵەڕێی سەختیش هەن کە دەچنەوە سەر ئەو لایەی پردی سیرات کە ڕووی لە بەهەشتە.

***

پێدەچێت یەکێك لە مەزنترین حیکمەتەکان ئەو قسەیە بێت کە دەڵێت "مرۆڤ، لەژێر زمانی خۆیدا شاراراوەتەوە." بەڕای من لەمەش گەورەتر ئەم وتەیەیە کە دەڵێت "ئەگەر دۆستت دەوێت خوا بەسە، ئەگەر هاوڕێشت دەوێت قورئان."

***

خەڵکی، دەرك و شتی دەرکپێکراو دەناسن، بەڵام بکەری کاری دەرکپێکردن ناناسن. ئەو شتەی کە دەزانێت و دەناسێت ڕۆحە، عەقڵ و چاو ئامرازن، ئەوەی دەبینێت ڕۆحە.

***

جووڵە، ئەگەر لە ئەنجامی پاڵنەرە عەقڵی و سروشتییەکان بێتە گۆڕێ نائۆملییە، گەر بەرهەمی پاڵنەرە ئیرادی و ویژدانییەکانیش بێت، ئەوکات ڕۆحی و مرۆییە.

***

عەدەم هیچێکی ترسناکە. هیچێتیش بیابانێکی بێسنوور و سامناکی وەهایە کە تەنانەت یەك گەردیلەشی تێدا نادۆزرێتەوە ئاماژە بۆ بوون بکات.

***

لە ئێستادا بە دینداران دەگوترێت "دەمارگیر". دەمارگیری بریتییە لە

پێداگری لەسەر ناحەق و سووربوونی کوێرانە لەسەری. بەڵام دامەزراوی لەسەر حەق ئەزیلەتە و ئەم ڕەفتارەی ئیماندارێش هەرگیز دەمارگیری نییە.

***

ئەلسەفەیەك کە پشت بە واریداتی ئیلاهی نەبەستێت، شکست و ئسکۆی بیرکردنەوەیە.

***

ئەلسەفەی ڕاستەقینە، ئازار و ژانێکە لەسەر ئاستی بیر و ڕۆح و، تەنها و تەنها لە ئەنجامی ئاگادارکرانەوەی مرۆڤ لەلایەن خوای گەورەوە و ناڕاستەکرانی بەرەو حیکمەت دێتە مەیدان.

# حیکمەت

مەشخەڵێکی خوایی وەها هەیە کە ڕێگای عەقڵ ڕۆشندەکاتەوە و ئاسۆی نوێی بە ڕوودا دەکاتەوە و، لە ڕۆشناییەکەیدا بە کاتژمێرێك دەتوانرێت مەودایەکی وەها ببڕرێت کە تەنها بە ساڵێك تەیدەکرێت: ئەویش ئیکرە.

***

کاری ئیکر گەڕانە بەدوای ڕاستیدا. لە ئاقیگەی ئیکردا کە توانا و بەهرە بەخشراوە خواییەکان وەکو کەرەستە بەکاردەهێنرێن، زۆرێك لە ڕاستییەکان دیسان لەبەر خاتری خودی ڕاستی، چەندەها جاری یەك لەدوای یەك دەگۆڕدرێن و، ئەسالەتی ئیکریش هەر ئەمەیە.

***

فیکر واتە بیرکردنەوە. بیرکردنەوە، لەبری ئەوەی بریتی بێت لە باوەڕکردن بەو شتانەی بە خەیاڵ و عەقڵدا دێن بەبێ هیچ جۆرە داوەرییەك و، بەفیڕۆدانی تەمەن بێت لە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی کەموکورتی کەسانی تر و ڕەخنەگرتن لێیان، بریتییە لە هەوڵ و کۆششێکی خاوەن فەزیلەت کە ئادەمیزاد بە حەقیقەت دەگەیەنێت و، هێزی خۆی لە لۆجیك و حیکمەت و واریداتە خوایییەکانەوە وەردەگرێت.

***

فیکر، لە ڕوویەکەوە، بریتییە لە ئاسکبوون و نوورانیبوونی عەقڵ. نەبوونی فیکر بە مانای نەبوونی عەقڵ نایەت. لەبەرامبەر ئەوەدا کە عەقڵ لە ڕووناکیدا هەموو شتێك وەردەگرێت و هەڵیان دەسەنگێنێت، فیکر زیاتر حەزدەکات لە تاریکیدا ئەو شتانە موتالابکات کە پێویستە موتالابکرێن. بەڵێ، فیکر و ڕۆح لە تاریکیدا زیاتر کاردەکەن...

***

حیکمەت یان فەلسەفەی ئیسلامی، هەردەم لە بناری ئەم جۆرە فیکرانەدا نەشونمای کردووە. لە هەر کات و شوێنێکدا بیرکردنەوەی دروست فەرمانڕەوا بووبێت حیکمەتی دروستیش هەبووە. لەو کات و جێیەشدا کە بیرکردنەوەی کەموکورت و ناتەواو بالادەست بوون، فەلسەفەی ناتەواو و فریودەر دەرکەوتووە.

***

ئەگەر فەلسەفە سەرەڕای هەموو کەموکورتی و ناتەواوییەکانی ناوی

حیکمەتی لێبنرێت، فەیلەسوفیش کە بە مانای عاشقی حیکمەت دێت، دەتوانرێت بە حەکیم ناوزەدبکرێت.

***

یەکێك لەو سەرچاوە گرنگانەی ڕووناکی کە بیری مرۆڤ لە لێڵی و، دڵیشی لە نامۆیی و وەحشەت دەپارێزێت و، ڕۆحی پاکژدەکاتەوە و، مەشخەڵێکی وەها دەداتە دەستی ویژدانی کە بە هەر جێیەك بگات ڕۆشنی دەکاتەوە و، بەهۆیەوە لە ڕووناکیدا دەتوانێت نووسراوی سەر ڕوخساری بوون و بوونەوەران بخوێنێتەوە، حیکمەت یان فەلسەفەی ئیسلامییە.

***

زانستەکان لە بازنەی عەقڵدا دەسوڕێنەوە، حیکمەت لە کەشوهەوای ڕۆحییاتدا گەشەدەکات. بەڵام مەعنەوییەت زۆر لەودیو بازنەی عەقڵ و ڕۆحەوە، لە هەرێمی ڕۆحانییەتدا لەدایکدەبێت و گەورە دەبێت.

***

ئامانجی حیکمەت ڕووناککردنەوەی ئەو ڕێگایانەیە کە بە خوا و ڕۆح دەگەن. ئەو ڕووناککردنەوەیە. هەندێك جار لە هونەرەوە بۆ خاوەنی هونەر و، هەندێك جاریش لە خاوەنی هونەرمەندەوە بۆ هونەر دەبێت. هەردوو ڕێگاکەش، بە ئەندازەی ساغی و دروستیی نییەت و ڕوانگەی ئەو کەسەی کە مەشخەڵی حیکمەتی بەدەستەوە گرتووە، دەتوانن مرۆڤ بە خێر و جوانییە ڕەهاکان بگەیەنن.

***

زانا(عالم) ئەو کەسە نییە کە دەزانێت، بەڵکو کەسێکە لە ویژدانیدا هەست بەو شتانە دەکات کە دەیانزانێت. مەودای نێوان زانا و نەزان چەند بێت، هی نێوان زانا لەلایەك و حەکیم و فەیلەسوفیش لەلایەکی دیکەوە ئەوەندەیە.

***

زانا، پەیوەندی لەگەڵ جیهانی بینراو و تەنها ڕووی مولکی شتان دەبەستێت؛ وەلێ حەکیم هەردەم سەرقاڵی جیهانەکانی غەیب و ئەودیو دەبێت...

***

زانا، ئەو شتە جوانانەی کە دەیانبینێت و شایەتحاڵیان دەبێت، ئەگەر لە ویژدانیدا لەشێوەی چێژێکی لەدووننیدا هەستیان پێنەکات، لەوانەیە شتانی جوان بە ناشرین ئەژماربکات. بەڵام حەکیم لەبەرئەوەی بەرمەبنای ئەودیوی پەردەی شتان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، ئەوا چالاکییە فیکرییەکانی هەروەك بڵێیت لەنێو ئەشوەی پەرستشێکدا ئەنجامدەدات.

***

هەموو شتێکی خۆشنەویستراو مەرج نییە بەرهەمی خراپ و ناشرین بێت. منداڵان حەز لە خوێندنەوە و بیرکردنەوە و دەرزی و دەرمان ناکەن... بەڵام بۆ یاریکردن لەگەڵ مار و ئاگر دەتریقێنەوە... دەکرێت لەهەمان ئەم چوارچێوەیەشدا جیاوازیی نێوان عەقڵی زانست و عەقڵی حیکمەت مرتالابکرێت.

***

فەلسەفەچییەکانی لای خۆمان زۆرترینیان ئەوانەن کە کەمترین پەیوەندییان بە فەلسەفەوە هەیە. ئەو شتەی کە زۆربەیان دەیکەن تەنها وەرگێڕانێکی نیوە و ناچڵە.. خۆزگە بیانتوانیبا ئەوەش بەباشی بکەن!

***

حیکمەت، لە ڕێگەی تەسدیق و شایەتیی ڕۆحەوە هەڵدەسەنگێنرێت نەک بە عەقڵ. بەڵێ، تەنها حیکمەت دەتوانێت لە حیکمەت تێبگات، عەقڵ یان دوژمنی حیکمەتە، یان دۆستێکی سارد و دوور.

***

ئەوەی کە زۆرجار عەقڵ حیکمەتی بەدڵ نییە، هۆ ئەوەیە کە دەرکی ناکات. بابەتەکانی حیکمەت هێندە ورد و سەروو عەقڵین، عەقڵێک کە بەهۆی ئیلهامەوە باڵی نەگرتبێت، زۆر زەحمەتە، بگرە ئەستەمیشە پێی بگات.

***

ئەگەر عەقڵ سپێنەی چاو بێت، حیکمەت ڕەشێنەکەیەتی. عەقڵ لە نووردا و دووهەمیشیان لە تاریکیدا لەدایکدەبێت...

***

عەقڵ بریتییە لە دەستلێدان لە تاریکیدا، بەڵام حیکمەت ڕوانینە بە چاو؛ عەقڵ ئاوڕنیشانی ڕوانینە بۆ بروون لە ڕێگەی چاویلکەوە، بەڵام حیکمەت بریتییە لە سەیرکردنی بەهۆی دووربین و تەلەسکۆبەوە.

***

عەقڵ ناتوانێت سنوورەکانی ماددە بەزێنێت.. تەنها حیکمەت و فەلسەفەی ڕاستەقینە دەتوانن ئەودیوی ماددە ببینن و هەستی پێبکەن.

جێی داخە خەڵکی لەبری بیستنی زایەڵەی بەگوڕ و قریوەنەدەری حیکمەت، دەچن گوێ بۆ دەهۆڵ و زوڕنا دەگرن...

***

دوو مەشخەڵ هەن کە ڕێگا تاریك و پێچاوپێچەکانی ژیان ڕووناکدەکەنەوە: یەکیان عەقڵی دروست و ساغ و ئەوی دییان حیکمەت...

***

زانستەکان ڕووناکیی عەقڵن؛ هەرچی حیکمەتیشە، ئەو هەورەبروسکانەن کە لە ئاسمانی ڕۆحدا دەردەکەون.

***

تێکەڵکردنی فەلسەفەی ماددەگەری و حیکمەت بەیەکتر، نیشانەی نەناسینی هەردووکیانە. بەداخەوە، ئەو شتەش کە ئێستا لە هەموو جێیەکدا دەبیسترێت، چەنەبازیی ئەم جۆرە نەزانانەیە!

***

ئەو حەکیمەی هەرێنەکەی لەگەڵ حیکمەتدا هەڵشێلراوە، لەسەر دیواری زیندان یان ژوورە بچووکەکەیدا تەماشای گەردوون دەکات و، دەگات بە پنتگەلێکی وەها دوور و دەستلێنەدراو کە گەشتیارانی دونیاگەڕیش نەیانتوانیوە یەك لە سەدی ئەوەی ئەوان ببینن...

***

بە فەیلەسووف دەوترێت "گەردوونناس"؛ ئەو کەسەی حەقیقەتناس و "عارف باللە" نەبێت، بە فەیلەسووفی ڕاستەقینە دانانرێت.

***

هەموو وتەیەك، بەگوێرەی پلەی عیرفان و کلتووری خاوەنەکەی، لە ڕۆحیەوە هەڵدەقوڵێت. ئەمەش تەنها ئەو کەسانە لێی تێدەگەن کە ئاسۆیان لەو ئاستەدایە. تێنەگەیشتن لە وتە و حەقیقەتە ورد و ناسکەکان یاخود بینینیان وەك شتانی بێنرخ، لە نەزانی و ڕەقونەقیی ڕۆحەوە نییە، بەڵکو هۆکارەکەی بێبەشبوونیەتی لە عیرفان.

میللەتان زۆرو زۆرو لەژێر پۆستاڵی هێزی بێ حیکمەتدا ناڵاندوویانە. لەڕاستیدا کاتێك هێزی بێحیکمەت حیکمەتی بێهێز دەشێلێت، تەنها یەك شت هەیە کە بەڕاستی دەپلیشێتەوە و دەگری: ئەویش حەقیقەتە...

***

قەدری زێڕ لای زێڕەنگەرە و، هی زانا لای زانایان و، هی ئادەمیزادیش لای ئەو مرۆڤە کامڵانەی کە بۆ ئاستی مرۆڤایەتی بەرزبوونەتەوە. گەوهەر لە بازاڕی ئاسنگەراندا غەریبە، زانا لەناو نەزاناناندا، مرۆڤ لەناو ڕۆحە ئاژەڵییەکاندا، حەکیمیش لە دونیایەکدا کە تێیدا داوەریی و ویژدان پشتگوێخراون.

# ویژدان لە ڕوانگەی حیکمەتەوە

ویژدان، کە ناونیشانی هەستکردنی مرۆڤە بە خۆی و بە بوونی خۆی، میکانیزمێکی ڕۆحە کە دەخوازێت و، هەستدەکات و، تێدەگات و، هەمیشە بە ڕووی ئەبەدییەتدا کراوەیە.

***

ئیرادە و زیهن و دڵ کە ئامرازەکانی هەستکردنی ڕۆحن، لەهەمان کاتدا گرنگترین بناغەکانی ویژدانیشن. لێرە مرۆڤ بە کەماڵاتی مرۆیی و، لەوێش ئادەمیزاد بە بەختەوەریی هەمیشەیی و بینینی خوای گەورە دەگەیەنن.

***

ویژدان، ئاوێنەیەکی بێگەرد و درەخشانی وەهایە کە خوای گەورە نیشاندەدات و، لە بوون بە تەرجومانی زاتی ئولوهییەتدا وێنە و هاوتای نییە. ئەوەندە هەیە پێویستە ڕۆحێکی دەست بکەوێت کە لێیەوە بوونی دەربخات و، گوێیەکی چنگ بکەوێت کە دەنگی خۆی پێبگەیەنێت!

***

لەبەرئەوەی ویژدان، هەست و موشاهەدە و ئیدراکی ڕۆحە، ئەوا هەمیشە سەرەو ژوورە و، کراوەیە بە ڕووی جیهانەکانی غەیبدا و، پێوەرەکانی پتەون و، پاکیزەیی و بێتاوانییەکەشی وەکو بێتاوانیی فریشتەکان ئەژمارکراوە.

***

موفتییەکان زۆرن و، زۆربەی زۆریشیان بە ئەندازەی تێگەیشتنیان سەر لە کۆمەڵێك سەرچاوەی دیاریکراو دەدەن و، فەتوا دەردەکەن. ویژدان موفتییەکی چاوتیژی وەهایە کە لە کاتی فەتواداندا حەقیقەت لەبەرچاوەگرێت و، لە فەتواکانیشیدا کەس ناخەڵەتێنێت و ناحەقی لە کەس ناکات.

***

ویژدانی گشتی، کە بە مانای هەست و دەرك و تێگەیشتنی زۆرینە دێت و (سواد الاعظم)یشی پێدەوترێت، زۆر بەکەمی فریودەخوات. بەتایبەت ئەگەر زانیاری و کەرستە وەرگیراوەکانی لە هەمان کانگای ئیلهامەوە سەرچاوەیان گرتبێت...

***

کاتێك ویژدانی گشتی لە حوکمی دادوەرێکی فریونەخۆر و فریونەدەر دابێت، هەموان تەنها ئەوەیان بۆ دەمێنێتەوە کە بە بڕیارەکانی ڕازیبن و بیکەن بە دادوەری خۆیان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە هەندێك بابەتدا کۆتا بڕیاردەر ئەوە.

***

ئەرکی پیرۆز، ئەو کارەیە کە خوای گەورە فەرمانی پێدەکات و، ویژدانە ساغەکانی وەك پێغەمبەرانیش جێبەجێی دەکەن. شتێکی لەم جۆرەش هەرگیز ناکرێت قبووڵ نەکرێت. خوا، حاکمی ڕەهایە و، ویژدانیش ڕاسترین ئاوێنەی ئەوە. ئەگەر جاروبار شتەکانی ناوی لێڵیش بین، زۆربەی جار بە ڕاستی و دروستی شتان نیشاندەدات.

***

ڕێکوپێکیی ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکانی کەسێك، لە ڕێکوپێکیی ڕۆح و نیکرییەوە سەرچاوە دەگرێت، لەدوونییەتی ناو ڕەفتارەکانیشی، لە کراوەبوونی ویژدانییەتی بە ڕووی جیهانی نموودیودا...

# زانست لە ڕوانگەی حیکمەتەوە

خوێندن و خوێندنەوە و موتالاکردن و گەڕان بەدوای مەعریفەدا، خۆراکە هەرە گرنگەکانی ڕۆحن. بێبەشبوون لەمانە، مەحرومبوونێکی جددیی وەهایە کە قەرەبووکردنەوەی مەحاڵە.

***

لەکاتێکدا بێگانەکان کونج و قوژبنی نیشتمانەکەمان دەپشکنن و، لە گەنجینەکانی زانست و هونەر و کلتووری ئێمە سوودوەردەگرن، ئەگەر ئێمە لە سەرچاوەکانی زانست و کلتووری تایبەت بە ڕابردووی خۆمان نەکۆڵینەوە و نەیخوێنینەوە و نەتوانین بیخوێنینەوە، پێویستە دابنیشین و بۆ حاڵی خۆمان بگرین.

***

بێنیازی و بێباکیمان وەکو میللەت بەرامبەر بەو هەموو بەرهەمە زانستی و نەدەبییەی کە باپیرانی شکۆمەندمان وەکو میرات بۆیان بەجێهێشتووین و دونیای ئەمڕۆ بە شەوق و تاسەوە بەدوویاندا وێڵە، ڕاستییەکەی تێگەیشتن لێی ئەستەمە...

***

ئەوانەی کە بەهۆی هەندێك زانیارییەوە کە بەتەواوەتی نایانزانن، یان

دەیانزانن بەڵام نەیانتوانیوە هەرسیان بکەن، بیر و زیهنی ئەوەکان لێڵ دەکەن، تەنها زیانبەخش نین، بەڵکو بە ناپاکیش ئەژمار دەکرێن.

***

ژان و چەلەکێشی، بێگەردترین سەرچاوەی ئیلهامن.

***

بوون و شکۆمەندیی میللەتێک لەگەڵ قووڵیی کلتوور و هونەری ئەو میللەتەدا ڕاستەوانە دەگۆڕێت. میللەتێک کە لە هەر چوار لای دونیادا بەرهەمە زانستی و هونەرییەکانی پێشچاو دەخرێن، بەئەندازەی بەرهەمەکانی دەڵێت "منیش هەم".

***

نرخ و شەرەف لەناو مرۆڤەکاندا، پابەندی زانست و مەعریفەتە. تەنانەت کەسێکی نزم و بێنرخیش هەمیشە دەتوانێت دەوڵەمەند ببێت، بەڵام هەرگیز نابێت بە کەسێکی شەرەفمەند.

***

زانیارییەکانی کەسێک هەرچەندە زۆر و زەبەندەش بن، هێشتا نابێت ببنە ڕێگر لەبەردەم خوێندنەوە و فێربوونی زیاتردا. زانایانی ڕاستەقینە، لەپاڵ ئەوانەدا کە هەمیشە سەرقاڵی لێکۆڵینەوە بوون، زیاتر لەناو ئەوانەدا دەرکەوتوون کە زانیارییەکانی ئێستایان بە کەموکورت زانیوە.

***

کاتێک حەق دەست بە قسە دەکات، نەزانی توورە دەبێت، دەمارگیری کێنج دەکەوێتە کوڵی، بەڵام زانست، گوێ هەڵدەخات و دەبیستێت.



ڕاست نییە گەر بە هەموو نەزانێك بوترێت زانیاری پێنییە. نەزانی ڕاستەقینە، ئەو کەسەیە کە لە هەستکردن بە حەقیقەت بێبەشە. کەسێکی لەم جۆرە ئەگەر زۆریش بزانێت هێشتا هەر نەزانە.



ژیان بینین و بیستن و خواردن و خواردنەوە نییە، بەڵکو هەستکردن و ئەزموونکردنە. زانا سوودبەخشە و نەزان زیانبەخش؛ بەڵام ئەوەی کە کەم دەزانێت زۆر لەوە زیانبەخشترە کە هیچ نازانێت. ئەوانەی کە بەتەواوەتی دەزانن و ئەوانەش کە هیچ نازانن ئەگەر بەدەگمەن فریویش بخۆن کەس فریونادەن؛ بەڵام ئەوانەی کە کەم دەزانن، فریودەرێکی زۆر باشن.



ئەو شت و بابەتە زانستییانەی کە دەگونجێت بوترێنەوە و ڕوونبکرێنەوە، بە شتانی ڕوون و، ئەوانەش کە ناتوانرێن بوترێنەوە و ڕوونبکرێنەوە، تا ئەندازەیەك بە شتانی تەماوی و هەرسنەکراو ئەژمار دەکرێن. لەبەر ئەم هۆیە، کاتێك باس لە تێنەگەیشتنی گەنج و لاوەکان لە قوتابخانەکاندا دەکرێت، پێویستە کەمێکیش لەسەر حاڵی مامۆستاکان هەڵوێستە بکرێت.



هەتا ئەو کاتەی قوتابخانەکان لەسەر دەستی مامۆستا ڕاستەقینەکان وەکو پەرستگایان لێدەکرێت، چارەسەرکردنی خاڵیبوونەوەی بەندیخانەکان شتێکی بێهوودەیە.



کاتێك مرۆڤ نییەتی کردنی کارێك دەهێنێت، دەبێت سەرەتا هەوڵبدات ئەو شتانە بەباشی فێربێت کە پەیوەندییان بەو کارە دیاریکراوەوە هەیە. کاتێکیش باوەڕی تەواوەتی هێنا بەوەی دەتوانێت ئەو کارە ئەنجام بدات، نابێت لە دەستبەکاربوونیدا کەمتەرخەمی بنوێنێت.



پێویستە هەموو کەسێك کار و پیشەی خۆی زۆر بەباشی بزانێت و، تا چەند دەگونجێت لە بواری پسپۆڕیی خۆیدا بمێنێتەوە. چونکە هەموو کەسێك ناتوانێت لە دەرەوەی چوارچێوەی پسپۆڕیی خۆی سەرکەوتوو بێت. هەربۆیە پێویستە پزیشك وەك پزیشك و، ئەندازیاریش وەك ئەندازیار بمێنێتەوە.. مامۆستا نابێت پزیشکی بکات و، پزیشکیش نابێت لە بواری یاسادا زۆر لە خۆی بکات.

## ناموس لە زمانی حیکمەتەوە

ناموس، هەوێنێکی پیرۆزی وەهایە کە لە پاکیزەیی و وەفا و ڕاستگۆییەوە بەرهەمدێت. بەجۆرێك، لە بنیاتنانی هەر بینایەکدا بەکارهاتبێت، لەرزین و کەوتنی بیناکە نەبینراوە. یان زۆر بەدەگمەن ڕوویداوە.



ناموس، بەرزترین لایەن و گرنگترین سیفەتی پاڵەوان و ئەمبەردەکانە. هەرزترین و نزمترین لایەنی دلێرەکانیش پیساکی و بێپەروابییانە لە بابەتی ناموسدا...



شەرەفمەندترین و بەنرخترین لایەنی هەر خانمێك، بێگەردبوونیەتی لەسەر ناستی پاکیزەیی و ناموس. ئەوانەی کە لە بابەتی پاراستنی ناموس و پاکیزەیی خێزانیاندا هەستیار نین، ڕوون و ئاشکرایە کە لە بواری پاراستنی ناموس و شەرەفی میللیشدا هەستیار نابن.

***

ناموس شتێکە و شەرەفیش شتێکی تر. لەوانەیە سەروەت ببێت بە بناغەی شەرەف، بەڵام بەخشەری ناموس نییە. هەرچی هەژاریشە، هەرگیز سیفەتێکی وەها نییە کە بتوانێت تێکی بدات.

***

ناموس، بە ڕێککەوتنی هەموو میللەتان و سوێندخواردن لەسەری، پیرۆزە و لەنێو ماکەکانی فەزیلەتدا یەکێکە لە گرانبەهاترین مرواریەکان. ئەوانەی بەهای ناموس نازانن، شەرەف و فەزیلەتیشیان ساختە و درۆیە.

***

ناموس، ئەڵماسێکی بێوێنەیە و پێویستە لە بەنرخترین و پارێزراوترین جێگادا هەڵبگیرێت. بەم جۆرە، ئەوەندەی تر نرخەکەی زیاد دەکات.

***

ئەوانەی کە بە ئەندازەی شەرەف و ناموسی خۆیان، بەرامبەر بە شەرەف و ناموسی کەسانی تر هەستیار نین، هیچ شتێکیان پێناسپێررێت و، لە هیچ بابەتێکدا متمانەیان پێناکرێت...

***

هەروەك چۆن شەمشەمەکوێرە حەزی بە ڕووناکی نایەت، بێدینەکان دین

و، نەزانەکان زانست و، بێڕەوشتەکان یاسا ڕەوشتییەکان و، ئەوانەش کە ناموس ناناسن، ناموسیان ناوێت و حەزی پێناکەن.

## درۆ لە چاوی حیکمەتەوە

درۆ، وتەیەکی کافرانەیە. لێرە، بەوەی کە زوو یان درەنگ لەبەرچاوی ویژدانی گشتیدا ئاشکرادەبێت، مرۆڤ دووچاری بێنرخی دەکات و، لەودونیاش مەحکوم بە دۆزەخ.

***

درۆ، ماستاوچییە؛ بەڵام حەقیقەت جددی و بێپەروایە؛ درۆ فشەڵ و پروچە، وەلێ ڕاستی شکۆمەند و بەوەقارە.

***

وڵاتێك درۆ و فێڵ و دزی و بوختانی تێدا بڵاوبووبێتەوە وێرانەیە؛ خەڵکەکەی هەژارن و، سەربازەکانیشی داگیرکار...

***

درۆ، هەر شکڵ و شێوەیەك بپۆشێت، هیچ کات ناتوانێت خۆی لە ویژدانی گشتی بشارێتەوە؛ بەتایبەتیش لە ڕوانینی پڕ لە فیراسەتی ئەوانەی کە بە نووری خوا دەڕوانن. هەرگیز!

***

هەرکاتێك درۆ ڕەواجی هەبێت و، گۆزەپان و مەیدانەکان دەنگی ئەویان تێدا بزرنگێتەوە، مانای وایە زەمانی ڕاستی بڕاوەتەوە.



ویژدانی گشتی لە دەریایەك دەچێت، ئەگەر درۆکان خۆیان هەنا ناوەڕاستەکەشی بخزێنن، دیسانیش دەریا کۆیاندەکاتەوە و لە کەناردا هەڵیان دەبژێرێت.



ئەگەر یەکێك هەبێت کە هەمیشە تف لە ڕوخساری درۆ و پێلینی و ڕیاکاری بکات و سووکایەتییان پێبکات، ئەوە ویژدانە.



درۆ و خۆدەرخستنەکان خاوەنی زاوەزاون، بەڵام حەقیقەت و سەرڕاستی بێدەنگن. هەورەبروسکەکان پێش هەورەگرمە بە شوێن و ئامانجی خۆیان دەگەن.

# حیکمەت و فەزیلەت

فەزیلەت، لەناو خەڵکدا لەسەر دۆشەك یان لەسەر خاك دادەنیشێت، بەڵام غرور لە کورسییە کەشخە و ڕازاوەکانیشدا جێی نابێتەوە. ئەگەر غرور گومەزێکی هەڵگەڕاوە و شێوەی بیرێك بنوێنێت، دەتوانرێت فەزیلەت بەو ئاسمانە بچوێنرێت کە وا دەردەکەوێت لەسەر ئاسۆ نیشتبێتەوە.

***

نەزانی، مرۆڤ بەرەو غرور و، حیکمەتیش بەرەو فەزیلەتی دەبات. غرور، ئەوەی زۆڵی نەزانییە؛ فەزیلەت، منداڵی ڕەسەنی حیکمەتە. غرور، لایەنگری خۆسەپاندن و ستەمە؛ فەزیلەت هی ئازادی و یەکسانی...

***

غرور، هەمیشە لە تەنهاییدا دەگەڕێت و بەدوای هاوڕێنەی خۆیدا وێڵە؛ بەڵام فەزیلەت هاوڕێ لەگەڵ ئاسوودەیی و ئارامی و دۆزینەوەی هاوڕێنەدا، هەمیشە لەناو خەڵکدایە.

***

دەوترێت "چاکە بە زۆر ناکرێت"، ڕاستە!. گەورەییش بە زۆر نایێت. ئەم دوانە هەردووکیان ویژدانی گشتی دیارییان دەکات.

***

هەندێك هەن لایان وایە ئەوانەی خۆیان بەدڵە گەشبین ن و، ئەوانەش کە خۆیان بەدڵ نییە ڕەشبین ن. ئەمانە، ستایشی دەستەی یەکەم دەکەن

و باوەڕیان بۆ دەکەنەوە، بەڵام وەك بڵێیت دەستەی دووهەم شاربەدەردەکەن لەڕاستیدا ئەوانەی کە پێویستە شاربەدەربکرێن ئەم "خۆبین"ە خۆپەرستانەن

***

گەشبین، هەموو شتێك بە باش و، ڕەشبینیش هەموو شتێك بە خراپ دەبینێت. ئەم دووانە هەردووکیان زیانبەخشن. بینینی باش وەك باش و، خراپ وەك خراپ "حەقیقەتبینی"یە.

# میدیا لە گۆشەنیگای حیکمەتەوە

میدیا، زمانی گۆیای هەستەکانی نەتەوە و، ڕابەری چین و توێژەکانی کۆمەڵگا و، بڵاوکەرەوەی بیر و هزریانە. ئەو، لەژێر چەپۆکی دەسەڵاتە ستەمکار و خۆسەپێنەکاندا هەمیشە یان دیل بووە یان ماستاوچی.

***

هەموو نووسەرێك پێویستە لە گوفتار و ڕەفتارەکانیدا خاوەنی ئەدەب و، لە زمان و قەڵەمەکەشیدا دارای پاکی و بێگەردی بێت. دەنا لەپێناو سوودی وەهمیدا، ڕەنگە ببێت بە هۆکاری چەندین زیانی حەتمی...

***

ئەو میللەتانەی کە نووسەر و دانەر و ڕۆژنامەنووسەکانی بەناڕاستەی بیری میللی و هەستی میللیدا ئەتوانن ئەو شتانە

بنووسن کە دەیانەوێت، چەندەها پەردە لە "دیلێتیی بابل"[١] دەهێننە سەر شانۆ و وێنای دەکەن.

***

بەهۆی ئەوەی میدیا دامەزراوەیەکە بە ڕووی هەموو جۆرە بیر و بۆچوونێکی دروست و نادروستدا کراوەیە، دەبێت بەگوێرەی میللەت و ڕۆحی میللەت ڕێکبخرێت.

***

پێویستە ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکان بەتوندی خۆیان لە خزمەتکردنی هەوا و ئارەزووی تاکەکان بپارێزن و، تەنها و تەنها ڕێنموونیکردنی خەڵکی وەک ئامانج بۆ خۆیان هەڵبژێرن.

***

چەندین کەللەسەری وەها لە گۆڕستانەکاندا هەن کە لەگەڵ خۆیاندا چەندەها کتێبی نەنووسراویان بردووە کە ستەم و خۆسەپاندن و سانسۆر نەیانهێشتووە بنووسرێن.

## خۆشەویستی لە ڕوانگەی حیکمەتەوە

خۆشەویستی واتە مەیلکردنی جوانییە ماددی و مەعنەوییەکان. خۆشەویستی بەرامبەر بە شتانی ماددی هەستی و جەستەییە و، بەرامبەر

---

١. مەبەستیە لە قۆناغی هەڵکشیران و کۆچی زۆرملێی جوولەکەکان بەرەو بابل پاش ڕووخانی شانشینی یەهودا لەسەر دەستی بابلییەکان. ئەم قۆناغە ساڵی (٥٨٧)ی پێش زایین دەستی پێکرد و ساڵی (٥٣٨)ی پێش زایین بە داگیرکرانی بابل لەلایەن فارسەکانەوە کۆتایی هات.

بە شتانی مەعنەویش ڕۆحی و ویژدانییە. لەم ڕوانگەیەوە، خۆشویستنی جوانییە ڕواڵەتییەکان، لەبەرئەوەی جوانییەکان هەمیشەیی نین لە دووتوێی خۆیاندا هیجرانیان هەڵگرتووە. هەرچی خۆشویستنی شتە مەعنەوییەکانە، هەمیشەییە و خاڵییە لە هیجران.

***

وتەی "گەر لە دڵێکدا خۆشەویستیی ڕاستەقینە هەبێت، دوژمنایەتی دەبێت بە شتێکی مەجازی؛ ئەگەر دوژمنایەتیی ڕاستەقینە هەبێت، خۆشەویستی شتێکی مەجازییە"، کلیلێکی ئەفسووناوی وەهایە کە زۆرێک لە گرفتەکان چارەدەکات.

***

بەدەستهێنانی ئەو شتانەی ئومێدەکرێن، هاوڕێ لەگەڵ ئومێددا، مردنی عەشقیشە. هەریەک لە ئومێد و عەشق باڵەکانی ڕۆحە عەوداڵەکانن و، لە دەمی گەڕاندا هەمیشە هاودەم و هاوڕێیان دەبن.

***

پزیشکەکان لە ڕێگەی نیشانەکانەوە کاریگەریی نەخۆشییەکان دەناسن؛ بەڵام نەخۆشەکان هەستی پێدەکەن و دەیچێژن. بەم پێیەی ئەمە، تەنها عاشقان لە عەشق و، مەجزوبەکان لە جەزبە و، عارفان لە چێژە ڕۆحانییەکان تێدەگەن؛ زانستی حاڵیش هەر ئەمەیە!

## ... وە مرۆڤ فریوی خوارد

ئەگەر من سیناریۆیەکم بنووسیبایە، یەکەم وشەم "... وە مرۆڤ فریوی خوارد" دەبوو.

## مێژوو لاپەڕەی پەند و عیبرەتەکانە

چاوەڕێکردنی دووبارەبوونەوەی ڕووداوە مێژووییەکان وەک خودی خۆیان شتێکی هەڵەیە. هەموو ڕووداوێک ئەگەرچی لەگەڵ دەستە خوشکەکانیشیدا لەیەکچوونی هەبێت، لە کات و شوێنێکی سنووردارادا ڕوودەدات. لەم ڕووەوە لە مێژووەوە پەند وەردەگیرێت نەک وانە.

***

لەنێو ئەو شتانەدا کە خۆریان بەسەردا هەڵدێت و ئاوادەبێت، شتێکیان تێدا نییە کە بەتازەیی بیبینیتەوە.

***

تاکە کەسێک و تاکە نەتەوەیەک دەستناکەوێت کە بۆ هەمیشە لە لوتکەکاندا مابێتەوە.

***

پێویستە مرۆڤ لەپاڵ لاپەڕە جوان و خۆش و نەرمونیانەکانی مێژوودا

لاپەڕە سامناك و ترسناکەکانیشی بخوێنێتەوە، هەتا ئاگاداریوونەوەی پێویست وەربگرێت. ئەگینا لەوانەیە هەمیشە لە بیرکردنەوەکانیدا وەك منداڵێك بمێنێتەوە.

# ئەو شتە بچووکانەی کە شتانی گەورە لەسەر شانیان هەڵدەگرن

دەنکە شقارتەیەك دەتوانێت دارستانێکی زەبەلاح کە بنیاتنانی هێندەی دونیایەك کاتی دەوێت، لە چرکەساتێکدا بکاتە خۆڵەمێش...

***

جاری وا هەیە شتێکی بچووکی بەئەندازەی دەنکە نۆکێك پیاوێکی گەورەی دیوناسا تەختی زەوی دەکات.

***

درەختی گەورە لە ناوکێکی بچووك و، مرۆڤی ڕێزلێنگیراو لە زیندەوەرێکی زۆر گچکەی تەنها بەوردبین بینراوو، خۆر لە گەردیلەکان و، دەریاکانیش لە دڵۆپەکانەوە پەیدادەبن. چەندەها ناوك و هۆکاری بچووك و، چەندەها ئەنجامی سەرسوورهێنەری دیکەش..!

## دەربارەی کات

کاتێك خواردن و خواردنەوەکان دەخەینە دەممانەوە و لەگەڵ جەستەماندا تێکەڵیان دەکەین، چێژ و سوود وەردەگرین. کاتیش هەر وایە: کاتێك چرکە و خولەك و کاژێر و ڕۆژ و هەفتەکانی دەکەین بە موڵك وماڵی خۆمان، هەست بە چێژەکانی دەکەین و حەزناکەین تێپەڕببن. ژیان، بەئەندازەی هەستکردن بە چێژەکەی و چەشتنی نەشوەکەی و، بەڵێندانی شتانی جوان و باش سەبارەت بە ئەمڕۆ و داهاتورمان، نیعمەتێکی نەبڕاوە و بەچێژە. بەڵام کاتێك خاڵی بوو لە هەست و شعوور و ئاگایی، لەگەڵ کوڵێکی سەرشاندا هیچ جیاوازییەکی نییە...

***

کات، بریتییە لە شێوازی درێژبوونەوەی ناکۆتای کۆمەڵێك لوولپێچ کە بە چەقێکەوە بەستراون. نە بازنەییە و نە هێڵێکی ڕاستە، بەڵکو بەرزی و نشێویشی تێدایە. وجودی کاتی ڕاستەقینە، تابلۆی نووسین و کوژاندنەوەیە (لوح المحو والإثبات).

## ئەفرینەکان

هەروەك چۆن لە جەستەی مرۆڤدا چەند خاڵ و پنتێك هەن کە دارای گرنگین بۆ ژیانی ئادەمیزاد. بەهەمان جۆر لە لاشەی میللەتیشدا بابەتگەلێکی زۆر

گرنگی وەك باوەڕ و شعووری مێژوویی و کلتووری میللی و ئامانجی باڵای میللی بوونیان هەیە. هەروەك ئەگەر تاك زەبرێك بەر یەكێك لەم پێنە گرنگانەی زیانی بکەوێت دەکەوێت و دەڕووخێت، بەهەمان جۆر گەر میللەتانیش یەكێك لەم لایەنە گرنگانەیان زامدار ببێت، بەحەتمی دادەڕمێن. هەزار نەفرین لەوانەی یارییان بە باوەڕ و مێژووی میللەت کردا هەزار نەفرەت لە دوژمنانی ڕابردوو! هەزار نەفرین لەوانەی کلتووری میللی و ئامانجی باڵای میللییان وێران دەکەن! هەزار نەفرین لەو بەدبین و ڕەشبینانەی کە داهاتوو ڕەش و تاریك دەبینن و وەهاش پیشانی دەدەن!

## شۆکی ڕۆژئاوا

شۆڕشی پیشەسازی ئەو ڕووداوەیەکە یەکەم شۆکی لە جیهانی ئیسلامیدا هێناوەتە مەیدان. هەروەك چۆن پشیلە مشك شۆك دەکات و پاشان بەدڵی خۆی یاری پێدەکات، ڕۆژئاواش لەو ڕۆژەوە جیهانی ئیسلامی تووشی شۆك کردووە و یاری پێدەکات.

## بەهەشت

بەهەشت، نە شوێنی بەرزبوونەوە و نە جێگای نزمبوونەوەیە. ئەوێ، هەرێمی قووڵبوونەوەیە لە چیژەکاندا.

وشەم ئاڵاهەڵگری لەشکری شاعیرانە.

# پەرستش

پەرستش، ناونیشانی گوزارشتکردنی تەواوەتی و کامڵی سیفەتی پەرستراویی خوای گەورە و، بەندایەتی و پەرستیاریی مرۆڤە. وە بریتییە لە ڕێکخستنی هەڵسوکەوتەکانی بەندەیەکی ڕاستەقینە بەرامبەر بە پەرستراوێکی ڕاستەقینە، لە چوارچێوەی پەیوەندی نێوان بەدیهێنەر و بەدیهێنراودا.

***

پەرستش، بریتییە لە سوپاسگوزاریی بەندە لە هەمبەر نیعمەتەکانی وەك بوون و ژیان و شعوور و ئیدراك و ئیمان؛ ئەنجامنەدانی پەرستشیش، ئەگەر کوفرییەکی ڕەهاش نەبێت، هیچ گومانێکی تێدا نییە کە سپڵەییەکی بێڕێزانەیە.

***

پەرستش، بریتییە لە ڕێگای ویساڵ و نادابی ویساڵ، لەپێناو گەیشتن بە بەختەوەریی دونیا و عوقبا کە ئامانجی ئیمانن، لەلایەن ئەو زاتەوە کە فەرمانی باوەڕهێنانی پێکردووین، کردوویەتییەوە و خستوویەتە بەردەممان، ئەوانەی ناتوانن ئەم ڕێگایە بدۆزنەوە و ئەم ئادابە بەدەستبهێنن، مەحاڵە بە خوا بگەن.

***

پەرستش، بریتییە لە کورتترین و سەلامەتترین ڕێگای گەیشتن بە (حق الیقین)ی ئەو ڕاستییە هەرە مەزنەی کە بەشێرەیەکی ئەزەری دەزانرێت. لە

هەر مەنزڵێکی ئەم ڕێیەدا کە شعوور بە باڵەکانی ڕێز و خەشیەت باڵدەگرێت و بەدوای "یەقین"دا دەگەڕێت، مرۆڤ بە وەسڵەتێکی جیاواز دەگات.



بەشێك لەو ڕۆحانەی کە بەڕووی ڕاستیدا داخراون و بە ناوی حەقیقەتەوە ئەمەنیان لە چیرۆکی بابەتە ئەزەرییەکاندا بەفیڕۆدەدەن، ئەگەر بەدرێژایی ژیانیان لە هەرێمی گۆیاترین زمانەکان و ئەفسووناویترین گوزارشت و بەیانەکانیشدا بژین، هێشتا ناتوانن هێندەی دەرزییەك ڕێگا ببڕن.



پەرستش؛ سەرچاوەیەکی خاوەن بەرەکەتی وەهایە کە هێز و پێز بە مەیلی باشی و ڕاستی و جوانی لە مرۆڤدا دەبەخشێت و، ئیکسیرێکی سیحرئامێزی وەهایە کە مەیلە خراپەکانی نەفس دەگۆڕێت بە چاکە و بەرەو جیهانی فریشتەکان ئاراستەی دەکات. ئەو ڕۆحەی هەموو ڕۆژێك چەند جارێك هاوڕێ لەگەڵ زیکر و فیکردا سەر لەم کانگایە دەدات، چووەتە سەر ڕێی بوون بە "مرۆڤی کامڵ" و، تا ئەندازەیەکیش بەرامبەر بە فێڵ و تەڵەکەکانی نەفس سێپەری بەستووە و چووەتە سەنگەرەوە...



پەرستش، لەسەر ڕێگای گەڕان بەدوای چۆنێتی بوون بە ئەهلی بەهەشت، بریتییە لە پڕۆسەی گەشەپێدانی توانا و لێهاتنە نهێنییە فریشتەییەکانی ناو ڕۆحی مرۆڤ و، کۆنترۆڵکردن و ڕێکخستنی توانا و لێهاتنە جەستەیی و ئازەڵییەکانی. هەروەك لە دوێنێ و ئەمڕۆشدا کەسانێکی زۆر هەبوون کە بەهۆی پەرستنەوە تەواو پێشی فریشتەکانیان داوەتەوە، ژمارەی ئەوانەش

کەم نین کە بەهۆی دوورییانەوە لە پەرستش بەرەو نزمترینی نزمییەکان بەربوونەتەوە.



چاکترین جۆری پەرستش ناسین و خۆشویستنی خوا و، بەسوودبوونە بۆ مرۆڤەکانی تر. لوتکەی ئەم لوتکەیەش، هاوڕێ لەگەڵ چاوساغیی ویژدانێکدا کە هەمیشە قیبلەنماکەی ڕاستی نیشاندەدات، بریتییە لە ڕەچاوکردنی ڕەزامەندیی خوای گەورە لە هەموو کارێکدا و، جۆشان و خرۆشان لەهەمبەر زایەڵەی (فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ)، و گەڕان بە شوێن ئەو ڕاستییە ڕاستەقینەدا کە ئامانجی باڵایە بۆ هەر باوەڕدارێك.

# مرۆڤ

مرۆڤ بوونەوەرێکە بە هەستە بەرزەکان پڕچەك کراوە و، توانا و لێهاتنی فەزیلەتی پێبەخشراوە و، مەفتوونی هەتاهەتایی و ئەبەدییەتە. تەنانەت لە ڕۆحی خراپترین و نزمترین مرۆڤیشدا هەرێمێکی پەلکەزێڕینەئاسا هەیە کە لە بیرۆکەی ئەبەدییەت و، عەشقی جوانی و، هەستی فەزیلەت پێکهاتووە؛ بەزیبوونەوە و گەیشتنیشی بە ئەمری، وابەستەی گەشەپێدانی ئەم توانا و لێهاتنانەی ناو ماهییەتیەتی.



پێویستە لەو ڕۆحی مرۆڤدا کە ئامەزرۆ و عاشقی ئەبەدییەتە بەدوای مرۆڤێتیی مرۆڤدا بگەڕێین، نەك لەو جەستە ئاژەڵییەیدا کە فانییە. لەم

ڕووەوە، لەو کاتانەدا کە لایەنی ڕۆحی فەرامۆش دەکرێت و، تەنها لە ڕوانگەی لاشەیەوە هەڵدەسەنگێنرێت، هەرگیز بە تێربوون نەگەیشتووە و نەشتوانراوە ئاسوودە و تێر بکرێت.

***

بەختەوەرترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە ویژدانی هەمیشە بە عەشق و تامەزرۆیی جیهانەکانی ئەودیو سەرمەستە. ئەوانەی کە لە زیندانی سنووردار و تەسك و خنکێنەری جەستەدا تەمەنیان بەسەردەبەن، ئەگەر لە کۆشکیشدا بژین، هەر بە بەندکراو هەژماردەکرێن.

***

یەکەمین ئەرکی هەموو مرۆڤێك بریتییە لە خۆدۆزینەوە و خۆناسین و، پاشان بەیارمەتیی هاوڕێتەی ئەو ماهییەتەی کە لەم سایەیەدا ڕۆشنبووەتەوە، ڕووکردنیەتی لە پەروەردگاری خۆی. ئەو بەدبەختانەی کە ماهییەتی خۆیان ناناسن و شارەزای نین و، ناتوانن پەیوەندی لەگەڵ بەدیهێنەری مەزندا سازبکەن، وەکو ئەو حەماڵانە دەژین کە نازانن لەسەر پشتیان چ گەنجینەیەك دەگوازنەوە و، بێئامانج تێدەپەڕن و کۆچدەکەن و دەمرن.

***

مرۆڤ لە خودی خۆیدا بوونەوەرێکی کۆڵەوارە، بەڵام ئەوەش حەقیقەتە کە لەسایەی پشتبەستنی بە توانستی ڕەهای پەروەردگارییەوە، خاوەنی دەسەلاتێکی نەبڕاوەیە. بەڵێ، لەبەر پاڵدانەوەیەتی بەو توانستە ڕەهایەوە کە دەبێت بە ڕووبار لە کاتێکدا کە خۆی دڵۆپێکە و، دەبێت بە خۆر لە کاتێکدا گەردیلەیە و، دەبێت بە پادشا لە کاتێکدا کە گەدایەکی بێدەسەلاتە.



مرۆڤ، بەئەندازەی یەکانگیربوون و ناوێتەبوونی لەگەڵ کتێبی بوون و ڕووداوەکاندا، لە دونیای دڵیدا بریسکەکانی حیکمەت بەدەردەکەون. لەسایەی ئەمەدا ئەو، ناوەڕۆکی خۆی دەناسێت؛ بە مەعریفەتی خوایی دەگات؛ پاشان دەڕوات و بە خوای گەورە واسڵ دەبێت. ئەوەندە هەیە دەبێت ئەم سەیر و سلوکەی کە دەخوازرێت لەسەر ئاستی بیر و هزر ئەنجامبدرێت، پێی لە بێباوەڕی و نکۆڵیکاری هەڵنەنورتێت.



مرۆڤە ڕاستەقینەکان چالاکییە هاوبەشەکانیان لەگەڵ ئاژەڵانی تردا، بەئاراستەی بەردەوامیدان بە نەوە و وەچەی مرۆڤ و، هاوڕێ لەگەڵ هەستی ئەرک و بەرپرسیارێتیدا و، لە چوارچێوەی پێداویستیدا ڕادەپەڕێنن. هەرچی ئەوانەیشە کە بەبێ پێوەر شوێن چێژ و ئارەزووە جەستەییەکانیان دەکەون، مەودای نێوان خۆیان و بوونەوەرانی دی بچووک دەکەنەوە و سنووری مرۆڤێتیی خۆیان دەبەزێنن.

## ڕێزگرتن لە مرۆڤ

ئاژەڵ کاتێک دەمرێت، لەبیردەکرێت و گۆڕەکەشی ون دەبێت. بەڵام مرۆڤ وەها نییە... ئەو میللەتانەی کە پارێزگاری لە یادەوەری و گۆڕی باوباپیرانیان ناکەن، نازانم داخۆ ئاگاداری ئەوە هەن کە ئەوانیان بۆ ڕێزی ئاژەڵان دابەزاندووە؟! لەڕاستیدا ڕێزگرتن لە مردووان، وەک سەلامەتی و گەرەنتییەک وایە کە بە زیندووانی داهاتوو دەبەخشرێت.

# هاوسەنگیی نێوان دڵ و جەستە

ژیانی ڕاستەقینە، ئەو ژیانەیە کە لەسەر ئاستی دڵ بەسەردەبرێت. ئەو مرۆڤەی کە لەسەر ئاستی دڵ بوونی هەیە، بە بینینی ڕابردوو و داهاتوو وەك دوو ڕووی یەك شت، دەبێت بە بوونەوەرێکی سەروو کات. ڕۆحێکی لەم جۆرە نە بە ئازارەکانی ڕابردوو داغدار دەبێت، نە بە ترس و نیگەرانییەکانی ئایندەش. هەرچی ئەوانەیشە کە لە دڵیاندا خۆیان نەدۆزیوەتەوە، بەهۆی ژیانە خام و کاڵ و کرچەکەیانەوە، هەمیشە لە بەدبینی و ڕەشبینیدان. لە دیدی کەسانی لەم جۆرەدا ڕابردوو گۆڕستانێکی ترسناك و، داهاتووش بیرێکی بێبنە؛ بەرن هەر ئازارە و بهێننەوە هەر ئازارە...

***

پەیوەندیی مرۆڤ بە ڕابردوویەکی دووروودرێژ و داهاتوویەکی نەبڕاوەوە. تەنها وابەستەی تێگەیشتنیەتی لە پلەکانی ژیانی دڵ و ڕۆح. ئەو ڕۆحە بەختەوەرانەی کە لەم ئاستەدا دەژین و دەرکی دەکەن، ڕابردوو لەشێوەی تەخت و خێرەتی باپیران و، داهاتووش لەشێوەی ڕێگایەکی دووروودرێژدا دەبینن کە ئەوسەری بە بەهەشت دەگات و، بەدەم خواردنەوەی بەردەوام لەو کەوسەرەی کە لە ڕێژدانیاندا هەڵیانقوڵاندووە، لەم خانی دونیایە دەڕۆن و کۆچدەکەن. هەرچی ئەو چارەڕەشانەیشە کە دەرکی ژیانێکی لەم جۆرە ناکەن، ژیانیان لە مردنیان خراپتر و، مردنیشیان تاریکییە لەناو تاریکیدا و لە دۆزەخ خراپترە.

***

کردار و ڕەفتارەکانی مرۆڤ و ژیانی ناوەوەی، یارمەتی یەکتر دەدەن و، یەکتری ڕێکدەخەن و، یەکدی کامڵ دەکەن. دەتوانین ئەمەش بە "بازنەیەکی داخراوی چاکەکاری" ناوزەد بکەین. بەگوێرەی ئەمە، هەروەك کردارەکانی وەك عەزم و پێداگری و دامەزراوی و بەردەوامی، لە جیهانی ناوەوەی مرۆڤیشدا ڕەنگدەدەنەوە و دونیای ناوەوەی نوورانی دەکەن، بەهەمان جۆر ڕۆشنبوونەوەی ویژدانیش، عەزم و ئیرادەی مرۆڤ دەنازوون و، ئاسۆی بەرزتری نیشاندەدەن.

***

ئەو بەختەوەرانەی کە ڕەفتارەکانیان لەژێر فەرمانی ڕۆحیاندایە، هەمیشە بەرەو ڕەزامەندیی بەدیهێنەر و مرۆڤایەتی و فەزیلەت هەنگاو دەنێن؛ قیبلەنمای ئەوان هەمیشە ئاماژە بە هەمان میحراب دەکات، گێچی جووڵانەوەشیان هەمیشە هەمان ئاراستە نیشاندەدات. ئەگەر جاروبار هەندێك لەرزینیش ڕوویدات، هاوڕێ لەگەڵ پەشیمانییەکی قووڵ و ناڵەیەکی بەکوڵدا، ئەو گوناهانەی کە دڵیانی تەنیوە لە ڕۆحیاندا دەتوێننەوە و لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبن.

***

ئەو ڕۆحە پیرۆزانەی کە هاوڕێ لەگەڵ ئەوپەڕی هەستیاریدا سەرجەم لێپرسراوێتییەکان هەتا دەگات بە بچووکترین وردەکارییان جێبەجێدەکەن، لەباڵی ئەوەدا کە دونیای دەروەیان بە ڕێسا و یاسا و ڕێکوپێکی و عەشقی ئەرك و لێپرسراوێتی ڕازاوەتەوە، لەسەر ئاستی جیهانی ناوەوەشیان هەمیشە وەك بوخوردانێك دەسووتێن و، ڕۆژانە چەند جارێك لە شەقەی باڵ دەدەن و، بە بەزمی فریشتەکان دەگەن.

***

تێگەیشتنێك کە بەدرێژایی چەندین سەدە لەگەڵ بیرۆکەی نەبەدییەتدا کولاوە و هەوێنی عەشقی هەتاهەتایی لە دڵماندا داناوە، بەتێپەڕبوونی کات جێی خۆی بۆ شکڵچێتیی بیرۆح و بۆچوونێکی میستیك(Mystic)ی وەها جێهێشت کە خاوبوونەوە و تەمبەڵیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئیدی لەو ڕۆژەوە ئەم بیرۆکە شوومانە ئیلهامەکانی خۆیان کە لەشێوەی بریسکەی گوڵەستێرەدان بە هاوتای شەپۆلە نوورانییەکانی وەحی زانی و، ڕێگای ڕووناکی ئێمەیان دووچاری تەم و غوبار کرد و، ئاسمانی مرۆڤی ئێمەیان تاریك کرد.

***

لەدوای هەموو ئەمانە، بەڕای ئێمە، دەکرێت چوارچێوەی پاڵەوانی بواری حەقیقەت بەم شێوەیە بکێشرێت: ئەو، لەسەر ئاستی جیسمانییەت خاوەنی جەستەیەکی پۆلایینی وەهایە کە دەتوانێت بەرگەی هەموو بەلا و گرفتێك بگرێت؛ لە ڕوانگەی بیر و هزریشەوە خاوەنی مێشکێکی پێکهێنەری وەهایە کە تێگەیشتن و بۆچوونی ڕۆژگاری خۆی لەگەڵ فەرمایشتەکانی خواوەندا تێکەڵ و ئاوێتە دەکات و، بەوێنەی کیمیاگەرێکی کارامە، لە هەموو ساتێکدا بە سەنتێزێك و پێکهاتنێکی نوێ دەگات؛ لەسەر ئاستی مەلەکەی ڕۆحی و توانا و بەهرەکانی دڵیشی، ڕۆحێکی وەهایە بە کوڵانی لە هەمان ئەو مەنجەڵانەدا کە بەدرێژایی سەردەمەکان شکڵ و شێوەیان بە مەولانا و یونس ئەمرەکان بەخشیوە، کامڵبووە؛ لە کۆتاییشدا دڵێکی کامڵی وەهایە کە باوەڕی بە فەلسەفەی "بوون بە مرۆڤێك لەناو مرۆڤەکاندا" کردووە و، فیداکارێکی وەهایە کە لەپێناو بەختەوەریی کەسانی تردا حەز و چێژەکانی خۆی لەبیرچووەتەوە.

# لێبوردەیی

سینەت بکەوە بۆ هەمووان چەند دەتوانیت، یا وەك زەریاکان وابێت! هاوڕێ لەگەڵ نیسان و باوەڕدا بجۆشێ و مرۆڤت خۆشبوێت، با دڵێکی مەحزوون نەمێنێتەوە کە دەستی یارمەتیت بۆ درێژ نەکردبێت!

* * *

چەپڵە بۆ چاکەی چاکەخوازان لێبدە، بەرامبەر بە دڵانی باوەڕدار خاوەنی جوامێری بە؛ لەگەڵ بێباوەڕانیش هێندە نەرم ڕەفتار بکە کە کین و نەفرەتیان بتوێتەوە، وە تۆ بە هەناسەکانت هەمیشە مەسیح بە!

* * *

کاتێك لەسەر ڕەنگاوڕەنگترین ڕێگایت و، بەیارمەتی سەرنجڕاکێشترینی گوفتار و بەیانەکان ئاڵوگۆڕ لەگەڵ ئاسمانەکاندا دەکەیت، هەرگیز لەیادت نەچێت کە لەدوای ڕابەری مەزن ئوممەتیت! لەبیرت نەچێت و، بیر لە حاڵی ئەو کەسانە بکەرەوە کە هیچ یەکێك لەم تایبەتمەندییانەیان نییە و، بەئینساف بە!

* * *

بە چاکە وەڵامی خراپەکان بدەوە، گوێ بە هەڵسوکەوتە نەساز و نەشیاوەکان مەدە! هەرکەسە و بە ڕەفتارەکانی کەسایەتیی خۆی دەردەخات. تۆ ڕێگای لێبوردەیی هەڵبژێرە و، بەرامبەر بەوانەی کە ئاداب و بەپێزو نازانن، عالیجەناب بە!

* * *

خۆشویستنی خۆشەویستی و دوژمنایەتیکردنی دوژمنایەتی، دیارترین نیشانەی دڵێکە کە بە باوەڕ خرۆشاییت. هەبوونی ڕق و قین بەرامبەر بە هەمووان، یان بریتییە لە دۆڕاندنی دڵ بە شەیتان، یاخود نیشانەی شێتییە.

تۆ مرۆڤت خۆشبوێت و، حەیرانی مرۆڤایەتی ببە!

***

دەخیل نەکەیت بۆ یەك جاریش نەفست بکەیت بە داوەر؛ چونکە بەڕای ئەو هەموو کەسێکی دیکە جگە لە تۆ تاوانبارە و هەموو تاکێك بەدبەختە. ئەمەش لە گوفتاری ئەو کەسەدا کە ڕاستگۆترینە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بە مانای لەناوچوونی خاوەنی ئەم بۆچوونە دێت. تۆ، هەتا دەتوانیت بەرامبەر بە نەفست ڕەق بە و، بەرامبەر بە کەسانی دیش لە نەرم نەرمتر بە!

***

ئاگاداری ئەو ڕەفتار و هەڵسوکەوتانە بە کە وات لێدەکەن کەسانی دیت خۆشبوێت و لەبەرچاوت خۆشەویستیان دەکات! لەبیرت نەچێت هەمان ئەو شتانە دەکرێت ببن بە هۆکاری خۆشویسترانی تۆیش. هەمیشە مرۆڤانە هەڵسوکەوت بکە و خاوەنی بەزەیی بە!

***

پێویستە مامەڵەی خوای گەورە لەگەڵ خۆتدا بکەیت بە پێوەر و، بەگوێرەی ئەمە ڕەفتار لەگەڵ خەڵکیدا بکەیت. ئەو دەمە، کاتێك لەناو خەڵکیدایت هاودەمیی "ئەو" بەدەست دەهێنیت و، لە وەحشەتی هەردوو تەنیاییەکە ڕزگارت دەبێت...

***

بەو جێگەیەی کە لە دڵتدا بۆ ئەوت تەرخانکردووە، دەتوانیت ڕێگەی خۆت لای خوا بپێویت، ڕێگە و پایەشت لەناو خەڵکدا، دەتوانیت بە هەڵسوکەوتەکانت لەگەڵیاندا، بپێویت و هەڵیبسەنگێنیت. بۆ چرکەیەك لە خوا بێئاگا مەبە! و "مرۆڤێك بە لەناو مرۆڤەکاندا!"

***

ئەگەر بەتەواوەتی ئەو بۆچوونە لە ڕۆحتدا چەسپێنیت کە مرۆڤانی باوەڕدار دەتوانن خراپەت بەرامبەر بکەن و زیانت پێبگەیەنن، بزانە کە ئەمە لە نەبوونی داوەریی ژیری و، کەمیی عەقڵ و، زەبوونی لەبەرامبەر نەفس و، ژێردەستەیی ڕۆحەوە سەرچاوەی گرتووە! وە خێرا سەر لە ڕەببانییەکی وەها بدە کە فووی ژیان بە دڵتدا بکاتەوە و چارت تەر بکات!

***

بەکورتی، بۆ ئەوەی خۆشەویستی و ڕێزی خۆت لەناو مرۆڤەکاندا پیارێزیت، لەبەر خاتری خوا شتان و کەسەکانت خۆشبوێت و، لەبەر خاتری خوا ڕقت لێیان بێت! وە کەسێکی وا بە کە هەمیشە دڵی بە ڕووی خوادا کراوە بێت!

## خۆبەکەمزانی

ئەوانەی ڕوویان لەسەر زەوییە، هەم لای خوا و هەم لای خەڵکی بە پلەوپایەی ئەبڕاوە دەگەن. ئەوانەش کە بەپێچەوانەی ئەمەوە لووتیان بەرزە و کەشوفش دەکەن و بەسووکی تەماشای هەموو کەسێك دەکەن،

هەمیشە لەلایەن خەڵکەوە بێزیان لێکراوەتەوە و، لای خواش دووچاری سزا کراون.

***

ئەوەی کە مرۆف خۆی بەدڵ بێت و خۆی بە گەورە بزانێت، بەڵگەیە لەسەر کەمیی عەقڵ و کاڵوکرچیی ڕۆح. کەسێك کە ژیر بێت و ڕۆحی کامڵ بووبێت، هەرشتێکی باش لە خۆیدا شك ببات، دەیگەڕێنێتەوە بۆ بەدیهێنەری مەزن و، هاوڕێ لەگەڵ هەستی مننەتباریدا هەمیشە لەبەرامبەریدا دەچەمێتەوە دەبێت.

***

خۆبەکەمزانی، لەهەمبەر قەدەری بەدیهێنەر و، سووکایەتی و ئازاردانی خەڵکەوە، ئاسوودەیی بە دڵی مرۆڤ دەبەخشێت. بەڵێ، ئەو کەسەی کە هەر لە سەرەتاوە سنووری خۆی دەزانێت و، باڵەکانی خۆبەکەمزانیی لە زەوی دەخشێنێت، لەبەرامبەر هەموو جۆرە سووکایەتییەکی گریمانکراوەوە کە دەگونجێت لە خەڵکییەوە سەرچاوە بگرێت، باشترین ڕێوشرێنی گرتووەتە بەر و لە قەڵایەکی پارێزراودایە.

خۆبەکەمزانی، نیشانەی کاملی و فەزیلەتی تاك و، کیبر و خۆبەگەورەزانیش نیشانەی نزمی و کەمیی مرۆڤن. کاملترین کەسەکان، ئەوانەن کە زۆرترین کاتەکانیان لەناو خەڵکدا بەسەردەبەن و هاودەمییان دەکەن. کەموکورتترین کەسەکانیش ئەو بەدناو و بەدبەختانەن کە خۆبەگەورەزانییان ناهێڵێت تێکەڵی خەڵك ببن و لەگەڵیان هەستن و دانیشن.

***

ئەو کەسانەی کە لە کۆمەڵگەی خۆیاندا بەهاو ڕێزیان نازانرێت، بەهۆی سیفەتی جوانی خۆبەکەمزانییەوە، زوو یان درەنگ بەرز دەبنەوە و شەرەف بەدەست دەهێنن. ئەوانەش کە گرنی دەروونیی لووتبەرزییان هەیە، لەئەنجامی لەیەکخشانی بەردەوامییان لەگەڵ کۆمەڵگادا، بەتێپەڕبوونی کات وەك شتێکی نامۆ و بێگانەیان لێدێت.

* * *

نیشانەی بەرزبوونەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤێتیی ڕاستەقینە خۆبەکەمزانییە و، نیشانەی خۆبەکەمزانیش نەگۆڕانی مرۆڤە لەدوای بەدەستهێنانی ئەو شتانەی کە لای کۆمەڵگا بەنرخن، وەك پلە و پایە و سەروەت و زانست. ئەو کەسەی لە هەریەکێك لەم بابەتانەدا، لە بیرکردنەوە و ڕەفتارەکاندا دووچاری گۆڕان بێت، نە خۆبەکەمزانی دەستکەوتووە و نە مرۆڤێتیی ڕاستەقینەش.

* * *

خۆبەکەمزانی، وەك کلیلی زۆربەی ڕەوشتە جوانەکانی دیکەش وایە. ئەو کەسەی بەدەستی بهێنێت، دەتوانێت ڕەوشت و خووە جوانەکانی تریش چنگ بخات. ئەو کەسەش کە ئەم ڕەوشتەی بەدەست نەخستووە، زۆربەی جار بێبەشە لە ڕەوشتە جوانەکانی دیکەش. پێغەمبەر ئادەم کاتێك هەڵخزا و کەوت، بەهۆی خۆبەکەمزانییەوە سەرلەنوێ هەموو ئەو شتانەی بەدەستهێنایەوە کە تایبەت بە جیهانەکانی غەیب، لەدەستی دابوون. شەیتانیش کە لەهەمان هەڵدێردا بەربوویەوە، بوو بە قوربانی کیبر و غرورەکەی.

* * *

لە تەکیە و خانەقاکاندا، هەمیشە ئەوانە بەرزبوونەتەوە و پەروازیان کردووە

کە سەریان لەسەر زەوی بووە. لە مەدرەسە و قوتابخانەکانیشدا، هەمیشە خۆبەکەمزانەکان زانیویانە چۆن سوود وەربگرن و پاشان بۆ کۆمەڵگاکانیان بەسوود بن. هەریەك لەوانەش کە لووتبەرز بوون و ڕەچاوی ئادابی تەکیە و خانەقایان نەکردووە و، ئەو چارەڕەشانەش کە غروریان نەیهێشتووە لە وانەی هیچ مامۆستایەکدا لەسەر ئەژنۆ دابنیشن، هەموو کات و سەردەمێك دۆڕاندوویانە و لەناوچوون.

***

لەبەرئەوەی کیبر و مەزنی لە سیفەتەکانی "زاتی ئولوهییەت"ن، ئەوانەی کە خۆیان بە گەورە زانیوە و لووتبەرزییان نواندووە، هەمیشە ناوی "قهار"ی ئەو پەخەی گرتوون و لەناوی بردوون. ئەوانەش کە سنووری خۆیان زانیوە و خاکی بوون، بەرەو حزووری ئەو بەرزبوونەتەوە.

# مرۆڤێتی

پێویستە مرۆڤ لە سەرجەم هەڵسوکەوتە باش و خراپەکانیدا بەرامبەر بە خەڵك، نەفسی خۆی بکات بە پێوەر و هەموو شتێکی پێ بپێوێت؛ هەرچییەك بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ کەسانی دیکەش پێی خۆش بێت و، هەرگیز نابێت لەیادی بچێت ئەو هەڵسوکەوت و مامەڵەیەی کە نەفسی پێی خۆش نییە، کەسانی تریش حەزی لێناکەن و پێیان خۆش نییە. بەم جۆرە، هەم لە هەڵسوکەوتی هەڵە و هەم لە ڕەنجاندن و ئازاردانی کەسانی دیش ڕزگاری دەبێت.

***

کاتێك خەڵکی چاکەمان لەگەڵ دەکەن، دڵمان نەرم دەبێت و لە ئاخماندا بەرامبەر بە خاوەنەکەی ڕێز و خۆشەویستی دەورووژێنێت. لەمەوە دەتوانین ڕێگەیەك بدۆزینەوە بۆ ئەوەی کەسانی دیش ئێمەیان خۆشبوێت. "مرۆڤ کۆیلەی خێر و چاکەیە". چاکە و خێریش، باشترین قەڵغانە بۆ خۆپاراستن لەوانەی کە لە شەڕیان دەترسین.

***

کەماڵی مرۆڤ، بەوەدا دەردەکەوێت کە تەنانەت بەرامبەر بەو کەسانەش کە خراپەیان بەرامبەر کردووە لە حەقپەرستی لانەدات و، چەند لە دەستی دێت بەرامبەریان چاکەکار بێت. بەڵێ، مرۆڤ دەبێت تەنانەت بەرامبەر بەو کەسانەش کە زیانیان پێگەیاندووە، لە جوامێری و هەڵسوکەوتی مرۆڤانە خۆی نەبوێرێت. چونکە، خراپەکردن هەڵسوکەوتێکی ناژەلانەیە؛ وەلامدانەوەی خراپەش بە خراپە، ناتەواوی و کەموکورتییەکی جددییە لە مرۆڤدا؛ هەرچی وەلامدانەوەی خراپەیشە بە چاکە، بەرزی و مەزنی و جوامێرییە.

***

سوودگەیاندن بە کەسانی دیکە سنووری نییە. تاکێکی هیممەتبەرز، دەتوانێت هەتا ئاستی بەخشینی ڕۆح، دڵسۆز و خەمخۆری کەسانی تر بێت. ئەوەندە هەیە ئەژمارکرانی ئەم جوامێرییە لە ڕیزی فەزیلەت بۆ ئەو کەسە، وابەستەی صەمیمییەت و حەسبیەت و نییەتپاکی و، دووربوونیەتی لە دەمارگیریی ئەتەوە و هۆزەوە.

***

مرۆڤێتی و جوامێریی کەسێك بەوە مەعبەر دەبێت کە لە دۆست و

خۆشەویستەکانیەوە نزیك بێت و، پاشان ئەم نزیکبوونەش بەردەوام و هەمیشەیی بێت. دووربوون لەوان و پاشان دەمکوتین لە جوامێری، بانگەشەیەکی بێبنەمایە، بەستنەوەی چاکەکارییەکانیشمان بە چاکەکانی ئەوانەوە کە بەرامبەرمان دەیکەن. یاخود بچڕاندنی جارناجاری چاکەکانمان بەرامبەریان و سزادانیان، نیشانەی کاڵوکرچیی ڕۆح و نەگەیشتنی مرۆڤە بە حەقیقەت.



یەکێك لە گەورەترین ئەو چاکانەی کە مرۆڤ دەتوانێت بەرامبەر بە کەسانی تر بیکات ئەوەیە کە چاو لە کەموکورتی و هەڵسوکەوتە نەشیاوەکانیان بپۆشێت. گەڕان بەدوای کەموکورتیی خەڵکدا بێتەدەبییە و، باسکردنیان بە ڕاست و چەپدا شایانی لێخۆشبوون نییە. هەرچی دانەوەی کردارە خراپەکانیشیانە بە نێوچاوانیاندا، وەك گورزێك وایە وەشێنرابێت لەو زنجیری برایەتییەی کە خەڵکی پێکەوە دەبەستێتەوە. ئەستەمە ئەو نێگۆزیانەی کە گورزێکی لەم جۆرەیان بەرکەوتووە، جارێکی دی یەکبگرنەوە و یەکێتی و یەکڕیزی دروستبکەن!



ئەوانەی گەورەترین چاکەکانی خۆیان بەرامبەر بە خەڵك وەك شتانی بێبەها دەبینن و، بچووکترین چاکەی کەسانی دیش بە گەورە دەزانن و بەرز دەیاننرخێنن، بەرەو ئەخلاقی خراپی بەرزبوونەوە و، مرۆڤگەلێکی کاملی وەهان کە لە ڕیزدانیاندا بە هەژاری ئەو گەیشتوون. کەسانی لەم شێوەیە، نە چاکەکانیان بە ڕووی خەڵکدا دەدەنەوە و منەتباریان دەکەن نە لەبەرامبەر نادادی و خراپەی خەڵکیشەوە سکاڵا دەردەبڕن.

# مرۆڤێتی یان جوامێری

ئەو مامەڵەی تۆ چاوەڕێیت خەڵکی لەگەڵت بکەن، هەمان ئەو مامەڵەیە کە خەڵکی لە تۆ چاوەڕێی دەکەن.

***

چوون بەدەم یارمەتیدانی کەسانی ترەوە، ڕەوانگۆترین بانگهێشتنامەیە بۆ کۆمەکی خوایی.

***

ئەگەر تەنها بە زەردەخەنەیەکیش بێت، نابێت دڵخۆشکردنی براکەت فەرامۆش بکەیت!

***

خۆشویستنی خەڵك و دەرخستنی خۆشەویستی بۆیان، نیوەی عەقڵە.

***

پێگەی تۆ لەناو خەڵکیدا، بەئەندازەی پێگەی ئەوانە لای تۆ.

***

ئەوانەی کە هەمیشە لە چواردەوریان تووڕە دەبن و هاوار دەکەن، بەپێچەوانەی ئارەزووی خۆیانەوە، دۆستەکانیان دەتۆرێنن و، دوژمنەکانیشیان خۆشحاڵ دەکەن.

***

ئەو کەسەی سەر بە هەموو شوێنێکدا دەکات، هەرگیز لە تۆمەت ڕزگاری نابێت...

***

لەبیرت نەچێت هەمان ئەو شتانەی تۆ ڕازی و دڵخۆش دەکەن خەڵکیش ڕازی و دڵخۆش دەکەن!

***

مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە کە هێزی چواردەورەکەشی بە قازانجی خۆی بەکاربهێنێت... بێعەقڵ و نەزانەکان، نەک هەر ناتوانن ئەم وزەیە بەکاربهێنن، بەڵکو بە لۆمەکردن و سەرزەنشتکردنی کەسانی چواردەوریان، ئەو هێزە لە دژی خۆیان بەگەڕدەخەن.

***

دارسێیەتی لەگەڵ دراوسێدا دەکرێت...

***

جارێکیش هەوڵبدە بە چاکەکردن ئەو کەسانە نەرم بکەیت کە لە شەڕیان دەترسیت!

***

لە کاتێکدا لێخۆشبوو بە کە توانای تۆڵەسەندنەوە و سزادانت هەبێت، هەتا لێبوردنەکەت مانا و بەهایەکی هەبێت.

***

هەرگیز لەبیرت نەچێت چەندین برای وەحات هەن کە لە باوەشی دایکدا دانەنیشتوون!

***

کەسانی دەمارگیر —جگە لەوانەی کە بێ هیچ شەرت و مەرجێك گوێڕایەڵن—، چواردەوری خۆیان دەشکێنن و دەڕژێن.

***

ڕازیکردنی هەموان بە هەموو پاڵەوانێك ناکرێت.

***

ڕێگای چاکە لەگەڵ کران بە چاکەکردندا تێدەپەڕێت...

***

ڕق و قین، مرۆڤ کوێر و کەڕ و دڵڕەق دەکات.

***

ئەو کارە چاك و خراپانەی کە بەرامبەر کەسانی دی دەیانکەین، تۆوی ئەو شتانەن کە سبەینێ ڕووبەڕووی خۆمان دەبنەوە.

***

لە ئاوێنەی ڕۆحدا، خراپەکانیش بەوێنەی چاکە ڕیز ڕیزن.

***

مرۆڤی نموونەیی، بەپێچەوانەی سوود و بەرژەوەندییەکانی خۆی، دەگرێت و خەڵکانی تریش ڕووناك دەکاتەوە...

***

ئەگەر زمانی درێژ و دەستی کورت لە مارەکان جوان بێت، سەبارەت بە مرۆڤ بە بەماربوون ئەژماردەکرێت.

***

بەهای لێخۆشبوون ڕاستەوانە لەگەڵ توانا و هێزی سزادان و تۆڵەسەندنەوە دەگۆڕێت.

# گوناه و پاکبوونەوە

ئەگەر گوناه شێوان و تێکچوونی فیترەت بێت، تەوبە و پەشیمانیش سەرلەنوێ گەڕانەوەیە بۆ فیترەت.

***

گوناهێك کە ژەنگی لە دڵ نیشتووە، وەکو ڤایرۆسێك وایە بەسەر جەستەدا زاڵبووبێت؛ زوو یان درەنگ جێکەوتی خۆی دەردەخات.

***

بیرنەکردنەوە لە مردن، لە ژەنگگرتنی دڵەوە سەرچاوە دەگرێت؛ ترسی مردنیش لە کەمی یەقینەوە...

***

گومانی خراپ، یان نەخۆشییەکی عەقڵییە یان چڵکی دڵە. ڕێگای ڕزگاربوون لەمانەش بریتییە لە هەستکردنی مرۆڤ بە گوناهەکانی خۆی.

***

تەنها دەتوانین بە قەرەبووکردنەوەی پشتگوێخستنەکانمان لەو چاڵانە ڕزگاربین کە بەهۆی پشتگوێخستنەوە تێیان کەوتووین.

***

ئەگەرماڵت لە شووشەیە، تەنانەت بەرد لە کولانەی خەڵکیش مەگرە!

***

ئەو کەسەی سەرقاڵی عەیب و عاری خەڵکە، بەدرێژایی ژیانی خەریکی ئەنجامدانی عەیب و عارە...

***

دەڵێن "نە سوار هەیە تا ئێستا نەگلابێت و نە ئەسپیش هەیە تا ئێستا نەکەوتبێت". گرنگ ئەوەیە دوای کەوتن ڕاست ببیتەوە و بێیتەوە سەر خۆت.

***

بیرۆکەی "بەیانی دەیکەم"، یەکێکی ترە لە ناونیشانەکانی بێئیرادەیی.

***

گەورەترین گوناهەکان لە ئەمامگەی "شەهوەت"دا ئەشونما دەکەن...
زاڵبوون بەسەر شەهوەتدا مەزنترین زاڵبوون و دەسەڵاتدارییە.

***

بێباکی و بێپەروایی بەرامبەر بە گوناهەکان، گەورەترین گوناهە.

***

درەخت ئەگەر وشك نەبووبێت، هەست بە بەهار دەکات...

***

کاتێك دەبینیت خوای گەورە سزات نادات لە سنووری خۆت دەرمەچۆ! بیر لەوە بکەوە کە مۆڵەتت دەدات و، بلەرزە!

***

ئیمانداری ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە هەمیشە لە پەیوەندیی بەردەوامدایە لەگەڵ خوادا. گوناهەکانیش ئەو بڵێسە زیانبەخشانەن کە ئەم پەیوەندییە دەفەوتێنن.

# نهێنی و پاراستنی نهێنی

نهێنی، وەك سەرچاوەی هێزێکی مەزن و سوپایەکی نەبەرد وایە کە دووچاری شکست نایەت.

***

نهێنی ناموسە، ئەو کەسەی بیپارێزێت -ئیدی هی خۆی بێت یان کەسانی دی- ناموسی خۆی پاراستووە. ئەو کەسەش کە نهێنی ئاشکرا دەکات، ناموس و شەرەفی خۆی دەخاتە مەترسییەوە.

***

هەندێك کار هەن نهێنی تیایاندا وەك خوری زیندە وایە، هەتا بەنهێنی بمێنێتەوە گەشەکی زیاتر لەگەڵ خۆی دەهێنێت.

***

بێدەنگیش حیکمەتێکە، بەڵام حەکیمەکانی ئەم بوارە زۆر کەمن، یاخود هەر نین.

***

ئەو کەسەی مرۆڤ نهێنی لەلا دەدرکێنێت، پێویستە هێندە ئەمین بێ کە ناموسیشی پێ بسپێرێت و، لە پاراستنیشیدا بەئەندازەی جلدیینی بەرامبەر بە ناموسی خۆی، هەستیاری بنوێنێت. ئەمانەت ناسپێرێت بە کەسێك کە ئەمین نەبێت، نهێنیش ناسپێرێت بە کەسێك کە ناموس نەناسێت.

* * *

ئەو کەسەی زمانی زیندانی دەکات، لەوە ڕزگاری دەبێت کە ببێت بە دیلی قسەکانی خۆی.

* * *

پاراستنی نهێنی و ڕێزگرتن لە نهێنیی کەسانی تر، بەهرەیەکی مرۆییە کە بەتەواوەتی وابەستەی ئیرادە و ئیدراکە. هەروەك چاوەڕێ ناکرێت کەسانی بێئیرادە نهێنی بپارێزن، بەهەمان جۆر ئەوانەش هێندە ساویلکەن کە دەرك بە سەرەنجامی گوفتار و کردارەکانیان ناکەن، ئەستەمە ڕازپارێز بن.

* * *

ئەگەر مرۆڤ پاش ئەوەی چەند جارێك نهێنییەکانی لەلایەن کەسانی دیکەوە ئاشکراکران، دیسان نهێنی لای هەمان ئەو کەسانە بدرکێنێت، نیشانەی ئەوەیە کە توانای دەرکی نییە و لە بابەتی هەڵبژاردنی هاوڕێی نهێنیپارێزدا لاوازە. کەسێك کە بەهۆی باوەڕەوە دڵی دامەزراوە و چاوی کراوەتەوە، نابێت لە ژیانیدا ئەوەندە بخەڵەتێنرێت و فریوبدرێت!

* * *

مرۆڤ، لەو جێگایانەدا کە پێویستن ڕوونکردنەوە بدات، ئەو شتانە ڕوون بکاتەوە کە دەکەونە سەرشانی، بەڵام پێویستە خۆیشی لەوە بەدووربگرێت

کە بەخۆڕایی سەرقاپی دڵی هەڵبداتەوە و نهێنییەکانی ئاشکرابکات. نابێت هەرگیز ئەوە لەیادبکرێت ئەوانەی لە هەموو جێگایەکدا و بە بەرچاوی هەموانەوە نهێنییەکانی خۆیان ئاشکرادەکەن، ڕۆژێك دێت کە هەم خۆیان و هەم کۆمەڵگاکەیان بەرەو مردنێکی حەتمی ڕادەپێچدەکەن.

***

پێویستە مرۆڤ ئەوپەڕی دووروپەرێزی بکات لە هەڵڕشتنی نهێنییەکانی بەملاولادا. بەتایبەت ئەگەر شتانێکی بێخێر و ناشرین و لەئەنجامیشدا بێسوود بن... چونکە ئەم حاڵەتە، زۆرجار دەکرێت ببێت بە هۆکاری ڕووداوگەلێکی ناپەجێ و ناخۆشی وەها کە دۆستان شەرمەزار و دوژمنان خۆشحاڵ دەکەن.

***

سینەکان، لەشێوەی سندووقدا و بۆ پاراستنی نهێنی بەدیهێنراون. عەقڵ قوفڵەکەیەتی و، ئیرادەش کلیلەکەی. هەتا ئەو کاتەی کە کێشە لەم کلیل و قوفڵەدا نەبێت، هەحاڵە کەس لە گەوهەرەکانی ناو ئەو سندووقە خەبەردار ببێت...

***

ئەو کەسەی نهێنیی خەڵکت لا باس دەکات، دەگونجێت نهێنیی تۆش بۆ خەڵکی بیبات. لەبەرئەوە نابێت بەهیچ شێوەیەك ڕێگا بدرێت کەسانی ترەی لەم جۆرە ئاگاداری بچووکترین و بێنرخترین کاروبار و حاڵەتەکانمان بن.

***

دڵی کەسی گەمژە لە سەری زمانیدایە، بەڵام دڵی کەسی ژیر لە بەرزترین بورجی سینەیدایە.



پێویستە خۆبەدووربگرین لە نهێنی گۆڕینەوە لەگەڵ کەسانی گەمژەدا.. چونکە کەسانی لەم جۆرە لەپاڵ خراپەی مەبەستداردا، دەکرێت هەندێك جار بە نییەتی چاکەکردن خراپەمان بەرامبەر بکەن.



نهێنی هەیە پەیوەندی بە تاکەوە هەیە؛ نهێنیش هەیە پەیوەندی بە خێزان و، تەنانەت پەیوەندی بە هەموو کۆمەڵگا و نەتەوەوە هەیە... کاتێك نهێنی تایبەت بە تاك ئاشکرا دەبێت، شەرەفی تاك و، کاتێك هی خێزان ئاشکرادەبێت شەرەفی خێزان و، کاتێکیش هی کۆمەڵگا ئاشکرادەبێت شەرەفی کۆمەڵگا لەکەدار دەبێت. چونکە نهێنییەکان هەتا لە سینەدا بمێننەوە سەبارەت بە خاوەنەکەیان وەك هێز وان، بەڵام کە دەست خەڵکی تر کەوتن، وەکو چەکێکی وەهای لێدێت کە دەکرێت لە دژی خاوەنەکەی بەکاربهێنرێت. لەبەر ئەمەیە کە باپیرانمان وتوویانە "نهێنییەکەت دیلی تۆیە. ئاشکرات کرد، تۆ دیلی ئەویت."



چەندین کاری بەنرخی وەها کە پێویستە تیایاندا پاراستنی نهێنی وەك پرەنسیپێکی سەرەکی ڕەچاو بکرێت، بەڵام لەبەرئەوەی نمایندەکانی نەیانتوانیوە ڕەچاوی بکەن، کارەکە هەنگاوێك پێش نەکەوتووە، تەنانەت هەندێك جار سەبارەت بە بکەر و هەڵسووڕاوەکانی ئەو کارە مەترسی جددی هاتووەتە پێش. بەتایبەت ئەگەر ئەم کارە لەو بابەتە ناسکانە بێت کە پەیوەندی بە ژیان و مانەوەی میللەتەوە هەیە!



دەوڵەتێك نهێنییەکانی خۆی لای دوژمنانی باسکردبێت، سوپایەك جووڵە ستراتیژییەکانی لەلای هێزەکانی بەرامبەر زانرابن، پیاوێکی بواری کار و بازرگانیش دەستی لای کێبڕکێکارەکانی ئاشکرا بێت، مەحاڵە ئەو دەوڵەتە بگەڕێتە سەر پێی خۆی و، ئەو سوپایە سەرکەوتوو بێت یان ئەو کەسە لە کارەکانیدا سەرکەوتن بەدەستبهێنێت.

# بەڵای زمان

قسەکردنی زۆر، نەخۆشییەکە هێما بۆ کەموکورتی عەقڵی و ڕۆحی دەکات. قسەی قبووڵکراو، ئەو جۆرەیە کە بە کورتترین ڕێگا و، بەبێ ئەوەی زەمینی بەرامبەرەکەی بشێوێنێت، شتێك لە بەرامبەرەکەی حاڵی بکات. باسکردنی شتێك بۆ کەسی دوێنراو پێویستی بە قسەی دوورودرێژ نییە؛ تەنانەت زۆرجار قسەی دوورودرێژ هەندێك زیانیش لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. چونکە قسەی زۆر لە دژیەکی خاڵی نییە، دژیەکیش لە هێنانە مەیدانی پرسیاری دیکەی جۆراوجۆر لە مێشکی کەسی بەرامبەردا. شتێکی لەم جۆرەش سەبارەت بە دوێنراو، لەوانەیە زیانی لە قازانجی زۆرتر بێت.



مرۆڤی ژیر، ئەو کەسەیە کە لەبری خۆی، ڕێگای قسەکردن بۆ ئەو کەسانە دەڕەخسێنێت کە وتەکانیان هەم بۆ خۆی و هەم بۆ کەسانی دیکەش سوودبەخشن. لەڕاستیدا قسەکردنی خەڵکانی دی لە حزووری کەسانێکدا کە

عەقڵیان بە زانست و هونەرە گەردوونییەکان و، دڵیشیان بە بەهرە خواییەکان کامڵبووە و پێگەیشتووە، بێرێزییە و، بێدەنگبوونی ئەو ڕۆحە کاملانەش سەبارەت بە کۆمەڵگا جۆرێك لە مەحروومبوونە.

***

قسەی کەم و گوێگرتنی زۆر نیشانەی فەزیلەت و کامڵی و، ئارەزووی ئەوەش کە مرۆڤ بیەوێت هەمیشە بڵێت و خەڵکی گوێی بۆ بگرن ئەگەر هەمیشە بە نیشانەی شێتیش دانەنرێت، هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە ناهاوسەنگییەکی ڕەها و بێشەرمییە.

***

پێویستە هەر قسەیەك کە دەکرێت بەئاراستەی چارەسەرکردنی کێشەیەك و وەڵامدانەوەی پرسیارێك بێت. کاتێکیش کە سەری قسەدەکرێتەوە، پێویستە دوورەپەرێزی بکرێت لە بێزارکردنی پرسیارکار و گوێگران.

***

بێدەنگبوونی مرۆڤ لە جێیەکدا کە پێویستە بێدەنگ بێت و، قسەکردنی لە شوێنێکدا کە پێویست بێت، شتێکی ئاسایی و سروشتییە. بەڵام ئەوەندە هەیە پێویستە هەمیشە لەکاتی قسەکردندا ئەو کەسانە پێشبخرێن کە وتەکانیان بەسوودترە. ئەمەش پێش لە هەر شتێکی دی پەیوەندی بە ئەدەبەوە هەیە و، وابەستەی دەرککردنە بە فەزیلەتی بێدەنگی. باپیرانمان چەند خۆش وتوویانە: "قسەکردن زیو بێت، بێدەنگی زێڕە".

***

مرۆڤ، لەبری قسەکردنی زۆر، بە قسەی بەسوود لە جێگە و ڕێگەی

خۆیدا، نرخ و بەهای خۆی بەرزدەکاتەوە. بەپێچەوانەوە ئەو کەسەی لە هەموو جێیەکدا هەر قسە دەکات، بەتایبەت ئەگەر ئەو بابەتانەی دەیانڵێت پەیوەندییان بە چەمکە باڵاکانەوە هەبێت و پێویستیان بە پسپۆڕی هەبێت، هەم دەکەوێتە چەندین هەڵەوە و، هەم نرخ و پێگەی خۆی نزم دەکاتەوە. وتەی "کەسی فرەبلێ هەڵەی زۆرە" وتەیەکی زۆر بەنرخ و بەجێیە.



مرۆڤ بە گوفتارەکانی خۆی دەردەخات و بە کردارەکانیشی مەزنیی ڕۆحی نیشان دەدات. ئەو فرەبلێیانەی کە سەرەی قسە بە کەسی تر نادەن وەك ئەوەی پێویست بێت هەموو قسەیەك ئەوان بیکەن، بەتێپەڕبوونی کات ئەفرەت و سەرۆکایەتی لە دۆستەکانی خۆیانەوە دەبینن. ئەم حاڵەتەش، وا دەکات خەڵکی گوێ لەو وتە جوانانەشیان نەگرن کە جاروبار لە وتنیاندا سەرکەوتوو دەبن و، لە ئەنجامیشدا خەڵکی بە چاوی سووك بۆ ئەو حەقیقەتە مەزنانە دەڕوانن تەنها لەبەرئەوەی کە فرەبلێیەك وتوونی. دیارە ئەمەش بێئەدەبی و بێڕێزییە بەرامبەر بەو حەقیقەتە بەرزانە.



قسەکردنی کەمیش بەرتەنەی خواردنی کەم و نووستنی کەم، لە کۆنەوە دروشمی کەسە کامڵەکان بووە. لە بابەتی گەشەسەندنی بەهرە و توانا ڕۆحییەکاندا یەکەم ئامۆژگاری بۆ مرۆڤ ئەوەیە کە ئاگاداری زمانی بێت و، خۆی لە قسەی بێجێ و "ناپێویست" بپارێزێت. چونکە ئەوانەی لە حەق و ناحەق و لە هەموو جێیەکدا دەمیان دەکەنەوە و شتی هەڵەق و مەڵەق دەڵێن، ئەو زمانەیان کە لە مێشکیان و دڵیان گەورەترە، هەمیشە دەبێتە هۆکاری دۆڕانیان، هەم لێرە و هەم لەو دونیاش.



بەتایبەت حاڵی ئەوانەی شتانێك دەڵێن کە خۆیان نایکەن، هەم تاڵە و هەم مەترسیدار. هەربۆیە پێغەمبەری خوا(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) پاراستنی زمان و نێوان لاقانی بە یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی فڕین بەرەو بەهەشت ئەژمارکردووە.



هەتا مرۆڤ لە ئەخۆشییەکانی وەك فرەبڵێیی و، عاشقبوون بە گوفتاری خود و، مۆڵەتنەدان بە قسەکردنی کەسانی دی بەدووربێت، لە بەدیهێنەر و بەدیهێنراوەکانەوە نزیکە و لایان خۆشەویستە. بەپێچەوانەوە، نە لای خوا و نە لای خەڵکیش ئەو شتەی دەست ناکەوێت کە چاوەڕێی دەکات.

# بەڵێن

یەك جار بەجێهێنانی بەڵێن لە هەزار جار بەڵێندان باشترە.



مانەوە لەسەر پەیمان، داخوازی و پێداویستیی مرۆڤێتی و زانینی بەها مرۆییەکانە.



زەویی فشەڵ هیچی لێ بەرهەم نایەت و، کەسی فشەڵیش خێری بۆ کەس نایێت.



هەستیاری لە جێبەجێکردنی بەڵێندا لە ئیمانەوە و، پەشیمانبوونەوە لە بەڵێن و پەیمانیش لە نیفاقەوە سەرچاوە دەگرێت.

***

بەشێک لە خەڵکی، بەدرێژایی ژیانیان هەوڵدەدەن پێداویستییەکانی ئەو پەیماننامەیە بهێننە دی کە ویژدانیان واژۆی لەسەر کردووە؛ بەڵام هەندێکی تر ێناگا لەم بەڵێننامە ویژدانییە دەژین. جا لەم حاڵەدایە ئیماندار و دووڕوو جیادەبنەوە.

***

مەڵێ فلانە کەس پەیمانی دا و نەیهێنایە جێ! بەڵکو بیر لەو پەیمانانە بکەوە کە شکاندووتن و پەشیمانبوویتەتەوە! مەڵێ وەک مرۆڤ ڕەفتاری نەکرد و کەس سەرکۆنە مەکە! بەڵکو ئەو هەل و دەرفەتە لەکیسچووانە بهێنەوە یادت کە دەتتوانی تیایاندا مرۆڤانە مامەڵە بکەیت!

## تەمکین

ئەگەر بەرەو ئاسمانەکانیش بەرزت بکەنەوە، لەبیرت نەچێت، سەرزەوی سەلامەتترە. ئەو کەسەی لە فڕۆکە بکەوێتە خوارەوە پارچە پارچە دەبێت، بەڵام ئەوەی قاچی لەسەر زەوی بێت وەک خۆی دەمێنێتەوە.

***

نابێت هەرگیز دەستبەرداری ئینساف ببین. چونکە هزر و بیری

ساغی لێوە پەیدا دەبێت. بەپێچەوانەوە زامگەلێکی وا دروست دەبن کە سارێژبوونیان زەحمەتە و، شنگەلێکی وا ڕوودەدەن کە چاکبوونەوەیان نەستەمە. ئەگەر دواتر بەشێوەیەکی دروست و گونجاویش هەڵسوکەوت بکەیت، نە دەتوانیت برینەکان تیمار بکەیت و نە شکاوییەکانت بۆ چاکدەکرێنەوە.

## باش و باشتر

ژیان نیعمەتێکی خواییە؛ نیعمەتێکی لەویش گەورەتر ژیانێکی دوور لە قەرزدارییە.

***

بەختەوەرترین مرۆڤ ئەوانەن کە گوناهەکانیان تەمەنکورترینن؛ لەوانیش بەختیارتر ئەوانەن کە هەمیشە داخراون بە ڕووی گوناهەکاندا.

***

خەڵك هەیە کات بە قازانجی خۆی دادەتاشێت، خەڵکیش هەیە بەدرێژایی تەمەنێك کات دایاندەتاشێت...

***

لەناو پیریدا گەورەترین دەرد کە مەینەتییەکانی پیرێتی چەند هێندە دەکات، خەم و خەفەتی پیرییە...

***

ڕووبەڕووبوونەوەی تاریکی شتێکی باشە؛ لەوەش باشتر لەبری جوێندان بە تاریکی، بریتییە لە هەڵگیرساندنی مەشخەڵێك ئەگەرچی بچووکیش بێت.

***

خێرێکی کەم و بەردەوام، لە خێرێکی زۆری ناوبەناو بەرەکەتدارترە.

***

هەنگاوێك بەرەو پاراستنی تەندروستی، لە سەد هەنگاوی سەر ڕێگای چارەسەرکردن باشترە.

***

تاقە گوانێکی زیندوو، لە مەڕێکی مردوو خێردارتر و بەپیتترە.

***

عیززەت و شەرەف لە موحەممەدیبوونی موسڵمانەوەیە..

***

چۆلەکەیەکی ناو مشت، لە کۆترێکی سەر لق باشترە.

# مامەڵە و هەڵسوکەوت

دینداری لە مامەڵەدا دەردەکەوێت.

***

ئیماندار بەجۆرێك کارەکانی ڕادەپەڕێنێت وەك ئەوەی بەمەبەستی وردبینی و پشکنین بخرێنە پێشچاوی خوای گەورە.

***

باران لە ئاسمانی هەوراویدا و، کردار و ڕەفتارە جوانەکانیش لەو دڵانەدا دەبینرێنەوە کە وابەستەی خوای گەورەن.

***

هەموو شتێك دەتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێت، بەڵام خوو زەحمەتە...

***

شیرخواردنی کەسی پیر عەیبەیە، بڕینەوەیشی لە شیر زەحمەتە.
تووڕەبوونی ئەو کەسەی کە هیچ تووڕە نابێت زۆر جیاوازە...

***

هەروەك سێبەری داری خوار ڕێك نییە، ئەو کەسەش ئەیتوانیبێت هاوسەنگیی دڵی بمباشی ڕێکبخات، هەڵسوکەوتەکانی ڕێك و ڕاست نابن.

***

ئەگەر خەڵکی بەگوێرەی هەڵسوکەوتەکانت جێیەکیان بۆ تۆ بڕیاردابێت، هەتا حاڵەتی خۆت نەگۆڕیت، چاوەڕێکردنی مامەڵەیەکی دیکە لێیان کارێکی بێهوودەیە.

***

هیچ شتێك هێندەی لەشساغی و بێوەیی شیرینتر و، بەقەدەر موحتاجبوون بە کەسانی تر تاڵتر و، بارتەقای دینداری لە کاتێکدا کە هەلومەرجەکان نالەبار و نەخوازراون سەختتر نییە.

***

هەریەك لە گوفتاری بێ کردار و، فیقهی بێ وەرع و، زانستێك کە بە ویلایەت و زوهد نەگات و، دۆستایەتی دورر لە وەفا و، ژیانی دورر لە لەشساغی و ێنوەمی، هەریەکە خەڵەتان و فریوخواردنێکن.

* * *

خەڵوەتخانەکان هێزی ئیرادە زیاد دەکەن. تاك لەوێندا خۆی دەدۆزێتەوە. لە خەڵوەتخانەدا گۆشەگیری بناغەیە. ئەمەش پێویستی بە (باطن)ێکی باش و، (ظاهر)ێکی ناناسایی هەیە. بەڵام تاکی کامڵ لەناو کۆمەڵگادا گەشەدەکات. فێربوونی تەواوەتیی پەیوەندییە مرۆییەکان تەنها لەناو کۆمەڵگادا دێتەدی...

* * *

وەکو عاشقان هاوڕێ لەگەڵ خۆشەویستیدا تێکەڵ بە یەك ببن، بەڵام لە کار و مامەڵەکانتاندا نامۆیی و بێگانەیی بکەن بە بناغە!

* * *

واز لە باسکردنی خۆت بهێنە؛ با ڕەفتارەکانت سی تۆ بکەن!

# یەکێتیی هەستە بەرزەکان

ئەوانەی بەئاشکرا دوژمنایەتی ناموس و شەرەف دەکەن سوك و ڕسوان؛ ئەوانەش بەنهێنی دەیکەن، کۆمەڵێك نادانی وەهان کە خۆیان ناناسن و شەرم لە خوایش ناکەن. لەڕاستیدا ئەوانەی هەڵگری هەستی ناموس و شەرەف نەبن، هەستیان بۆ نەتەوە و نیشتیمانیش نییە.

# نیعمەت و هەستکردن بە نیعمەت

خوای گەورە چەندین نیعمەتی لە ژمارنەهاتووی بە بەندەکانی بەخشیوە، گەورەترینی ئەم نیعمەتانەش بریتییە لە شعووری هەستکردن بە نیعمەتەکان.

* * *

لەشساغی نیعمەتێکە بەسەر شانی لەشساغانەوە، بەڵام تەنها نەخۆشان قەدری دەزانن...

* * *

گەورەترین نیعمەتی خوا بۆ مرۆڤ نیعمەتی ئیمانە. شوکری ئەم نیعمەتە مەزنەش سەرپێچینەکردنی ئەو و یاخینەبوونە لێی.

* * *

شوکرانەبژێریی نیعمەتەکان بەشێوەیەك کە لە جۆری خۆیان بێت، نیشانەی قەدرزانی و نرخشناسییە.

* * *

زۆرجار نەزان و نەفامەکان بەختەوەر و خۆشگوزەرانن و، ئەربابی حیکمەتیش لەڕووی ماددییەوە بەدبەختن. ئەمەش دەریدەخات کە نیعمەتەکانی دونیا بەگوێرەی نرخ و بەهای مرۆڤەکان دانابەزن.

* * *

زانینی بەهای شتان گرنگە نەك نرخیان،

***

نیحسان و لوتفەکانی خوای گەورە بەگوێرەی مەزنیی خۆیەتی؛ هەرچی داراکردنی سوپاسگوزاریشە، بەقەدەر قەد و باڵای ئەوانمیە کە نیعمەتی بەسەردا ڕژاندووین.

***

نیعمەتێك مرۆڤ لە خوای گەورە دوور بخاتەوە، گەورەترین موسیبەتە.

# خەمخۆری و دڵسۆزی

هیممەتی هەموو کەسێك بەئەندازەی نرخ و بەهایەتی؛ ئەو کەسەی تەنها بیر لە خۆی دەکاتەوە، یان هیچ مرۆڤ نییە، یاخود بوونەوەرێکی ناتەواوە. ئەو ڕێگایەی بەرەو مرۆڤێتیی ڕاستەقینە دەڕوات، بەوەدا تێپەڕدەبێت کە لەتاو بیرکردنەوە لە کەسانی دی -ئەگەر پێویستی کرد- مرۆڤ خۆیشی لەبیربکات.

***

پێویستە مرۆڤ لەبەرامبەر عەیبەکانی خۆیەوە داواکاری گشتی بێت و، لە هەڵسەنگاندنی عەیب و کەموکورتی خەڵکیشدا پارێزەریان بێت.

***

مرۆڤی کامڵ و دۆستی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە تەنانەت لە هاتنە دەرەوە لە دۆزەخ و چوونە ژوورەوەی بەهەشتیشدا پێت دەڵێت "فەرموو پێش بکەوە!"

***

مرۆڤی ڕاستەقینە، هەلومەرجەکان هەرچۆنێک بن، ئەو کەسەیە کاتێک شیر دەدۆشێتە سەتڵەکەی خۆیەوە، سەتڵی خەڵکی تر لەبیر ناکات.

***

تۆ تۆو بوەشێنە و بڕۆ، ئیدی کێ دەیدوورێتەوە با بیدوورێتەوە!

## تەوحید و خۆشویستنی خوا

کاتێک یەکێک دڵی یەکێکی تر دەخوێنێتەوە و ئەو شتە دەڵێت کە بە دڵیدا تێدەپەڕێت، پێویستە لەبری قسەبێژ تەماشای ئەو خوایە بکرێت کە ئەو قسەیەی هێناوەتە سەر زمانی و، دەبێت بوترێت "خوا هێنایە قسە". ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە هەم هەڵەی تێدا نییە و هەم لە مەترسی دوورە.

***

ئەو کەسەی داواکارییەکانی لە خوا داوادەکات، هەرگیز مەحروم نابێت.

***

ئەو کەسەی پشت بە خوا دەبەستێت هەمیشە زیندووە، ئەگەر بشمرێت، بەهۆی ئەو پەیوەندییەوە کە لەگەڵ خوادا هەیەتی، بە زیندوو ئەژماردەکرێت.

***

جوانترین جۆری خۆشویستنی خوا ئەو جۆرەیانە کە لەلایەک بە خۆشەویستی خوا و لەلایەکیش بە ترسان لە خوا دەورەدراوە.

***

ئەوەی کە خوای گەورە مۆڵەتی داوە و هەلومەرجی ڕەخساندووە بتوانین ئەرمان خۆشبوێت، پایەیەکی چەند گەورەیە!

***

لە ڕێگەی هەزار و یەك ئەزموونەوە سەلماوە هەرکاتێك وترابێت "ئەم هۆکارانە دەمانگەیەنن بە ئەنجام"، هێندەی نەبردووە ئەو هۆکارانە وردوخاش بوون. ئەو شتەی دەکەوێتە سەرشانمان ئەوەیە کە لەتێو پشت بە خوا بەستندا هەتا ئەو پەڕی توانامان کاربکەین.

***

ئەو کەسەی بڕیاری لەناوچوونی بۆ دەرکرابێت، ئەگەر تۆش لێی نزیکنەبیتەوە، کە وەرزی خۆی هات بێ هیچ گومانێك قودرەت یەخەی دەگرێت.

# مەشخەڵی بەرزەخ

شەونوێژ وەك مەشخەڵێك وایە لە دەستی مرۆڤدا بەرامبەر بە تاریکیی بەرزەخ. لەبنەڕەتدا هەریەکێك لە پێنج کاتەکانی نوێژ لایەنێك لە لایەنە تاریکەکانی مرۆڤ ڕۆشن دەکەنەوە و، ڕووناکی ئاڕاستەی پارچە دیاریکراوەکانی کات دەکەن. ئەگەر نوێژ نەبێت ئادەمیزاد ناتوانێت لەسەر ڕێڕەوی دین بڕوات و دامەزراو بێت. پێغەمبەرمان (عَلَيهِ أَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) ئەگەر نەیتوانیبێت بە شەو شەونوێژ بکات، لە ڕۆژدا قەزای دەکردەوە.

پێدەچێت بەم کارەی، ویستبێتی فێرمان بکات لە ژیانماندا جێ بۆ بۆشایی نەهێڵینەوە...

## دونیای ناوەوە

هەر بیر و بۆچوونێك کە بچێتە ڕۆحمانەوە و ڕەگ دابکوتێت، زوو یان درەنگ میوەی خۆی دەبەخشێت. ئەم میوەیە، دەکرێت "توبای بەهەشت" یان "زەققومی دۆزەخ" بێت... کەسێك مێشکی چاکە و جوانی و لێبووردەیی و لێخۆشبوونی تێدا بێت، هەمیشە دڵی لە باخچەکانی بەهەشت دەچێت. کەسێکی لەم جۆرە هەرگیز لەناکاو نابێت بە کەسێکی وا کە دزی و جەردەیی بکات و، زینا بکات و پیاو بکوژێت و، مەی بخواتەوە و ماددەی هۆشبەر بەکاربهێنێت و، هەموو کەسێك بە سووك تەماشا بکات و ڕەخنە لە هەموو شتێك بگرێت. هەموو ئەم هەڵسوکەوتە نەخوازراوانە، پێویستیان بە فیکر و نەخشەی خراپ و لەپێشینە هەیە.

ئەو کردارانەی کەسانێك دەیانکەن کە مێشکیان لە بیری خراپ و بێسوود پڕە، بەتەواوەتی بریتین لە ڕەنگدانەوەی دونیای ناوەوەیان. لەبەر ئەم هۆیە، هەموو تاکێك هەتا لەسەر ئاستی دونیای ناوەوەی بە ڕێکوپێکی و دامەزراوی و ڕاستڕەوی نەگات، لەسەر ئاستی دەرەوەی هەرگیز جوان نابێت و جوان دەرناکەوێت. ئەگەر جوانیش ببێت و جوانیش دەربکەوێت، بۆ ماوەیەکی درێژ ناتوانێت بەو شێوەیە بمێنێتەوە نابێت.

## بیری چاکەخوازی

یەکێک لەو ڕێگا هەرە گرنگانەی کە مرۆڤ بە نەتحکردنی دڵی کەسانی دی دەگەیەنن، بریتییە لە چاوەڕێکردنی هەل و دەرفەت بۆ چاکەکردن لەگەڵیان و. هەر کە دەرفەتیش هەڵکەوت ئەنجامدانی چاکەیە بەبێ کات بەفیرۆدان. خۆزگە دەمانتوانی دڵمان بە بەردەوامی لەسەر بیری چاکە و چاکەخوازی فورمیش بکەین!

## دۆست و هاوڕێیەتی

ئەو کەسەی ڕێز لە دۆست و هاوڕێکانی دەگرێت و چاکەیان لەڕوودا دەنوێنێت، لەبەرامبەر دوژمنەکانیەوە چەندەها بەرگریکاری وەها بەدەستدەهێنێت کە پشتگیری لێدەکەن.

***

پێویستیی مرۆڤ بە هاوڕێی ڕاستگۆ، لە پێداویستییە گرنگەکانی دیکەی کەمتر و لەدواتر نییە. ئەو کەسەی لەسەر ئاستی دۆست و خۆشەویستەکانی لە ئارامی و ئاسوودەییدا بێت، لە زۆر بابەتی دیکەشدا لە ئارامی و سەلامەتیدایە.

***

مرۆڤی زیر ئەو کەسەیە هەر کە پەیوەندی لەگەڵ چواردەورەکەیدا تێکچوو، خێرا دڵیان بەدەست دەهێنێتەوە و، ئاشتیان دەکاتەوە و دۆستایەتی خۆی لەگەڵیاندا نوێ دەکاتەوە. لەمەش ژیرتر ئەو کەسەیە کە هەستیاری دەنوێنێت و، هەرگیز لەگەڵ دۆستەکانیدا کێشە و گرفتی بۆ دروست نایێت.

***

هەروەك چۆن دوژمنی نهێنی هەن، دۆستی نهێنیش هەن. دۆستی نهێنی، باسکردنی خۆی بە ماستاوچێتی دادەنێت. کەواتە هەروەك چۆن هەوڵ بۆ ناسینی دوژمن دەدرێت، پێویستە بەهەمان جۆر گەڕان بەدوای دۆستیشدا فەرامۆش نەکرێت. چونکە ئەو دۆستانەی کە بەبێ گەڕان دەدۆزرێنەوە، لەوانەیە بەئەندازەی پێویست جێی متمانە نەبن.

***

بەردەوامبوونی پەیوەندی و خۆشەویستیی نێوان هاوڕێیان، وابەستەی ئەو بڕاردان و لەیەکتر تێگەیشتنەیە کە لە ڕێگای مەشروع و کاری مەعقولدا لە ئاستی یەکتردا دەینوێنن. ئەوانەی کە لەسەر ئاستی بیر و ڕەفتارەکانیان بەرامبەر بەیەکتر فیداکار نەبن، دۆستایەتییەکانیشیان کورت و کاتی دەبێت.

***

ڕاستگۆیی کەسێك لەهەمبەر دۆستەکانیدا بەئەندازەی هەستکردنیەتی بە خۆشی و ناخۆشییان لە ویژدانیدا وەك ئەوەی هی خۆی بن. کەسێك کە بە گریانی دۆستەکانی نەگری و، لەگەڵ پێکەنینیاندا پێنەکەنێت، بە دۆستی وەفادار نەژمار ناکرێت.

***

دۆستایەتی و برایەتی ڕاستەقینە، بەوەدا دەردەکەوێت کە کەسەکە تەنانەت لەو کاتانەشدا کە برا و هاوڕێکانی لەڕووی دونیاییەوە بار و حاڵیان باش نیە بەردەوامی بە پەیوەندییەکانی بدات. کەسێك لە ڕۆژگاری ناخۆش و نارەحەتدا و لە کاتی مەترسیدا لای هاوڕێکانی نەبێت، هیچ پەیوەندییەکی بە دۆستایەتییەوە نییە.

***

دۆستی ڕاستەقینە، ئەو کەسەیە دۆستەکەی لەو جێیەدا دەپارێزێت کە ئەگەری کەوتنی هەیە و دەستی یارمەتی بۆ درێژدەکات؛ نەك کەسێك کە لە هەموو کارێکیدا سەری بۆ بلەقێنێت...

***

ئەوانەی زوو زوو لەگەڵ چواردەورەکەیاندا دەکەونە کێشمەکێش و ململانێ دۆستیشیان کەم دەبێت. کەسێك بیەوێت دۆستەکانی هەم زۆر بن و هەم وەفادار، پێویستە بەحەتمی خۆی لە مشتومڕی ناپێویست لەگەڵیاندا بپارێزێت.

***

گەر تۆ خۆت بە سەربەرزی بهێڵیتەوە، خەڵکیش بە سەربەرزت دەزانن!

***

دۆستایەتی پێش لە هەر شت کاری دڵە. ئەوانەی وادەزانن کە بە ڕیا و خەڵەتاندن بەدەستدێت، هەمیشە فریویان خواردووە. ئەگەر لە چواردەوری کەسانی لەم شێوەیەدا، سێ چوار ساویلکە کە بە پیاهەڵدان و ماستاوچێتی

خەڵەتاون بۆ ماوەیەکی کاتیش کۆببنەوە، هەرگیز نەگەڕێ دۆستایەتییەکی ڕاستەقینە و دووروودرێژ لەگۆڕێدا نییە.

## مرۆڤە گرانبەهاکان

لەناو خەڵکیدا هەروەک کەسانێک هەن کە زۆر هەرزانن و دەکرێت بە نرخێکی زۆر هەرزان بکڕرێن، کەسانی گرانی وەهایش هەن کە بە دونیایەک زێڕ و ئەڵماس ناکڕرێن. ئەوانەی نەتەوەکان بەرز دەکەنەوە و سەرکەوتنیان پێدەبەخشن، لەم جۆرەی دووهەمن. مرۆڤە گرانبەهاکان، بەوێنەی هەوری پڕ لە باران، هەمیشە لە ئامانجی باڵا و فەزیلەت پڕن. بە هەر شوێنێکدا تێپەڕن، پێبزانن یان نا، بە سەوزی لەدوای خۆیانەوە جێی دەهێڵن...

***

عومەر موختار بە ئیتاڵییەکانی وت "من دەمرم؛ بەڵام بەنەبەدی دەمێنمەوە. وەلێ ئێوە بە مردن لەناو دەچن." موسڵمان ژیانی زۆر بە گران دەفرۆشێت؛ ژیانی فانی دەبەخشێت، ژیانی هەمیشەیی وەردەگرێت. ئەو شتەش کە ئێمە بە ژیانەوە بەستووەتەوە و ناوی لەشاغی لێنراوە، لە گوڵێک دەچێت کە جوانییەکی چەند ڕۆژەی هەیە. پەڕەی گوڵ تا ئەو کاتەی زیندوو و لەشاغە زۆر سەرنجڕاکێشە، بەڵام کە سیس و وشک بوو هیچ نرخێکی نامێنێت.

## مەزنترین سەرمایە

ئەخلاق و ویژدان و پەروەردە و ڕێز و نەرمونیانی دراوگەلێکن کە لە هەموو وڵاتێك دەخۆن و، لە گەوهەرێك دەچن کە کێشە و گرفتە نابوورییەکانی بازاڕ کار لە نرخیان ناکەن. ئەو کەسەی ئەم شتانەی بەدەستهێنابێت لە بازرگانێکی ناودار و بڕواپێکراو دەچێت کە ئەگەر سەرمایەی دیکەشی نەبێت. لە هەموو جێیەکدا دەتوانێت کڕین و فرۆشتن بکات.

## فانیبوون

تریەتریەکانی دڵ، چرپەی بەستەی ئەو مردنەن کە لەگەڵ لەدایکبووندا دەستی پێکردووە.

* * *

زۆربەی خەڵکی دەزانن کە قیامەت نزیکبووەتەوە. بەڵام نازانم داخۆ چەند کەس هەست بەوە دەکەن کە هەر ڕۆژە و پارچەیەك لە پارچەکانی بەرپا دەبێت؟!

* * *

لاوان ئەگەر بیانزانیایە دوای بەسەرچوونی گەنجیتی و جوانییان چەند بێ نرخ و بەها دەبن. پێدەچوو بەبێ وچان بەدوای ڕێگاکانی گەنجیتی و جوانیی هەمیشەییدا ڕێڵبوونایە...



چەندین شت هەن کە مرۆڤ بە گرنگیان دەزانێت و نرخ و بەهایان پێدەدات. بەڵام لەگەڵ خۆیدا دەمرن و لەناودەچن، وەلێ ئەو بیر و کارە سوودبەخشانەی کە دەیانخەنە ڕوو، لەدوای گۆڕیش دەمێننەوە و بۆ هەتاهەتایە دەژین...

# پێکەنین و گریان

گریان بریتییە لە هەوڵی ناسوودمەبوونی ڕۆحە هەستیارەکان و. هەڵمەتی کوژاندنەوەی ئاگری ویژدان بە ئاوی فرمێسکەکان. ئەوەندە هەیە زۆربەی خەڵك لەو جێیەدا کە پێویستە بگرین پێدەکەنن و، لەو جێیەشدا کە پێویستە پێبکەنن دەگرین...



کاتێك ڕۆح گڕی گرت و ویژدانیش سووتا، ئیدی ئەوکات مرۆڤیش دەگری. ئا لەم ساتەدا فرمێسکەکان دێن بەهانای مرۆڤەوە و ئاگری ڕۆح دەکوژێننەوە. بەڕای من پەیوەندیی نێوان "چەشم" و "چەشمە"ش[1] هەر لەمەوە دێت...

[1]. دوو وشەی فارسین یەکەمیان بە مانای "چاو" و دووهەمیان بە مانای "کانی" دێت.

# دەربارەی ترس و ئومێد

ترسان لە خەڵکی مرۆڤ ئیفلیج دەکات، چارەرێکردنی سوود و قازانجیش لێیان، زۆرجار دەبێتە هۆکاری خەیاڵشکان و نائومێدی. تاکە چارەسەری نەترسان لە هیچ کەسێکیش بریتییە لە ترسان لەو بەدیهێنەرەی کە مرۆڤ پێویستە لێی بترسێت. چارەسەری خەیاڵشکان و نائومێدیش بریتییە لە پشتبەستن و متمانەبوون بە زاتێك کە هەمیشە بەهێزە و هەردەم توانای هێنانەدیی بەڵێنەکانی هەیە.

# دوو ڕۆژ بۆ هەمووان

باوەڕمان وایە هەموو کەسێك دوو جۆر ڕۆژی هەیە: یەکێکیان تایبەت بە خۆی و ئەوی تریان تایبەت بە نەوەکانی داهاتوو. ئەگەر ئێمە ئەمرۆ لەسەر ئاستی یەکێکیان بگرین و بناڵێنین، بە پشتبەستن بە کۆمەکی خوای خاوەن ڕەحمەتی ڕەها، لەو باوەڕەداین کە لەوەی تریاندا پێدەکەنین.

# ئەوەی گریان و پێکەنین

ڕۆژێك بەتێپەڕبوونی تەمەن لەگەڵ بیری بەندایەتیدا تارتە نەبوونێت، لە ناسۆیەکدا کە دەبوو قازانج بکات، دووچاری بەدبەختیی دۆڕان دەبێت. ئەگەر ئەو بیتوانیایە دەرك بەمە بکات، بۆ ئەو شتانە دەگریا کە ئەمڕۆ پێیان پێدەکەنێت و لە پەشیمانیدا ئەدی دەچەمییەوە...

# تەمەنی بەپیت

تەمەندرێژەکان ئەوانە نین کە زۆر دەژین، بەڵکو ئەوانەن کە هەرچۆنێك بووە میوە و بەرهەمێکی زۆریان لە ژیانیاندا بەدەستهێناوە. بەگوێرەی ئەم پێوەرە، هەروەك دەکرێت کەسانێکی تەمەنکورتی وەها هەبن کە سەد ساڵ ژیابن، بەهەمان جۆر دەگونجێت کەسانێکیش هەبن کە بە پازدە ساڵی، هاوڕێ لەگەڵ پیت و بەرەکەتێکدا کە تەنها بە هەزاران ساڵ بەدەستدێت، سەریان تا کەشکەشان بەرزبووبێتەوە.

# ژیانی ڕاستەقینە

ژیان بریتییە لە ناونیشانی چرۆکردن و نەشونمای سەردەمی منداڵی و، گوڕوتین و ڕۆحی هەوڵدان و تێکۆشانی تانی گەنجێتی و، هەوڵدان بۆ زیندوو مانەوە لەپێناو شادبوونەوە بە دۆستان و خۆشەویستان لە ڕۆژگاری پیریدا. بەداخەوە ئەوانەی لە پەنجەرەی کوفرەوە تەماشایان کرد، گاه وەك کۆمیدیایەك و گاه وەك تراژیدیایەك بینیيان و، ئەمەش بیری شەوق و شوکری لە ئادەمیزاددا کوشت!

## تەنیایی

هەستی تەنیایی، دەردی بێدەرمانی ئەو زەبوون و دەربەدەرانەیە کە دڵیان بەگرێزەی ئەبەد قورمیش نەکردووە و هەرێنی بیری هەمیشەییان لە ڕۆحیان نەداوە. پێدەچێت کەسانی لەم جۆرە هەتا ئەو کاتەش کە هەستەکانیان بە ئیمان باڵ دەگرێت و ڕۆحیان ڕووی ڕاستەقینەی بوون دەبینێت. نە دەتوانن لە کەشوهەوای تەماریی بەدبینی و ڕەشبینی ڕزگاریان دەبێت و، نە لەگەڵ تێکڕای بووندا ئاریتە ببن و دۆستایەتی و هاوڕێیەتی لەگەڵ هەموو شتێکدا پێکبهێنن.

# بونیادی هەست

بونیادی هەستەکانی مرۆڤ ڕاستەوانە لەگەڵ جۆری ژیان و، ئازار و ژان و ڕەنجی کێشراو دەگۆڕێت. دونیای هەستی ئەوانەی هەمیشە لە دەرەوەی ژیان ماونەتەوە و، دوورن لە بیرکردنەوە و چلەکێشان، بەرتنەی توانا و لێهاتنەکانی دیکەیان، هەرگیز گەشە ناکات و، کەسانی لەم جۆرە هیچ کاتێك لەگەڵ وجوددا ئاوێتە نابن.

# خراپە

ئەوانەی بەردەوام خەریکی خراپەکردنن، ئەگەر کەسیش ڕێگەیان لێ نەگرێت، ڕۆژێك دێت کە بێگومان دەبن بە ژێر باری خراپەکانی خۆیانەوە. بەڵێ، سەرەنجامی خراپکارییە بەردەوامەکان، زوو یان درەنگ لەناوچوونە.

•••

شتە عەرەزی و ڕووکەشەکان ئەگەر وەك شتانی بەردەوامیش دەربکەون هەر کاتین. کاتێك تەمەنی سروشتییان کۆتایی هات، ئەوانیش وەك هەر شتێکی تر دەمرن. ئەوەندە هەیە هەندێك جار بەها مرۆییەکانیشمان لەگەڵ خۆیان دەبەن.

# هەندێک لە نەخۆشییەکانی دڵ

ڕبنداری ڕاستەقینە، ئەو کەسەیە کە لە هەمان کاتدا خاوەنی بەرزترین ئەخلاق و ڕەوشتە. لە پەرستشەکانیدا ڕیا و، لە هەڵسوکەوتەکانیدا خەڵەتاندن و، لە دڵیدا ڕق و دووڕوویی بوونیان نییە. ڕیا و خۆدەرخستن مرۆڤ لە خوا و، خەڵەتاندنیش هەم لە خوا و هەم لە خەڵکی دووردەخاتەوە... ڕق لەگەڵ نەفرەت و، دووڕوویش لەگەڵ لەعنەت باس دەکرێن و یاد دەکرێنەوە.

## هەڵپە

هەڵپە، تەڵەیەکە شێر دەکات بە مشک، هەرکەس جارێک تێیکەوت ئیدی لە دەستی ڕزگاری نابێت.

***

هەڵپە دێوێکی وەهایە پشتی بەهێزترین پاڵەوانەکانیش دەدات لە زەوی.

***

کەسێک بەخیل نەبێت، بە تێپەڕبوونی کات دەبێت بە کەسێک کە خەڵکی بەخیلی پێدەبەن.

***

نێرمی لای نێرمەران و، هەڵپە لای هەڵپەکاران، دوو دۆزەخی دونیایین.

* * *

تەماعبازی، زنجیری دیلێتییە لە گەردنی نادەمیزاددا.

* * *

پێویستی، وەك مۆزرانە وایە و هەستی شەرمكردن كوێر دەكات.. بەتایبەت ئەگەر تەماعیش پاڵپشتی لێبكات زۆر خراپترا

* * *

مرۆڤ لە بارەشی ئەو شتەدا دەمرێت كە مەفتوونییەتی.

# لادان

هەتا ئێستا لەپێناو "مەعلیكە سوڵتان"[1]دا چەندین جار چارۆکەمان بە ڕووی چەندەها شرێتی نادیار و نەناسراودا هەڵداوە. بەڵام نە ئەو لەمیلایەمان دۆزییەوە كە عەشقەكەی ڕاپێچی بیابانەكانی كردین، نە توانیشمان بگەڕێینەوە بۆ ئەو كەنارانەی كە جێمانهێشتبوون...

* * *

كاتێك كۆمەڵگا لە ڕەگەكانی ڕۆحی خۆی دووردەكەوێتەوە، ڕوانگەی دەگۆڕێت و سیستەمی بەهاكانیشی ناوەژوو دەبێتەوە. لە كۆمەڵگایەكی لەم جۆرەدا جیهاد ناوی "دەستدرێژی" و ستەمیش ناوی "دادپەروەری" لێدەنرێت!

---

[1]. بریتییە لە ئەفسانەیەکی ڕۆژهەڵاتی کە تێیدا مەعلیکە سوڵتان پەرییەکی زۆر جوان و ماوداری مەبەراوە و لەودیو جیهانی قەڵەمڕەو دەژی. بەمەبەست نووسەر لەهەمان کاتدا مەبەستی توانیمان بێت لە هەڵوێستی "تۆزی تورك"ەکان کە لە چەندین شیعردا مەعلیکە سوڵتانیان وەك هێمایەك بۆ ڕزگاری داناوە و بە بالایدا هەڵیانداوە.

ئەزمت لە مێژوو دەکرێت و، شتە قەبە و ناشرینەکانی ئەمڕۆ هێندە ستایش دەکرێن، دەبرێن بە ئاسماندا و، سووکایەتی بە ئەدەب دەکرێت و، چەپڵە بۆ بێشەرمی لێدەدرێت و، داوێنپاکی و پاکیزەیی وەك خێو نیشاندەدرێت و، پیرۆزیی بە شتێکی سروشتی دادەنرێت و، لەکاتێکدا کە وابەستەبوون بە میللەت و ڕابردووەوە بە ناشرینترین شێواز سووکایەتییان پێدەکرێت، بێرەگی و بێرەگان دەبرێن بە ئاسماندا!

***

تێکەڵاویبوون و هەستان و دانیشتنی بەردەوام لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەردا و ئارەزووی هاودەمیی بەردەوام لەگەڵیاندا، یان نیشانەی خاڵی لاوازیی مرۆڤە، یان ئاماژەیە بۆ تێکچوونی سروشت، یاخود هێمایە بۆ هەڵگرتنی تایبەتمەندییەکانی ئەو ڕەگەزە.

## نەزانی

نەزانی وەك پەچەیەك وایە بەسەر ڕووی شتانەوە، ئەو بەدبەختانەی نەیانتوانیوە ئەم پەچەیە بدڕێنن، هەرگیز ناتوانن دەستیان بە مانا بەرزەکانی ناو گەردوون بگات. گەورەترین نەزانی نەناسینی خوای گەورەیە، بەتایبەت ئەگەر ئەمە لەگەڵ خۆپەرستیدا یەك بگرنت. ئیدی وەك حاڵەتێکی شێتیی وەهای لێدێت کە چارەسەری نییە.

# ڕووی ڕاستەقینەی دونیا

هەندێك کەس دونیا بە کەمێك پارە و کەمێك لەشساغی دادەنێن. ئەگەر ئەم بۆچوونە سەبارەت بە کەسانێك کە هەموو شتێك بۆ ماددە دەگێڕنەوە و، دونیا بەو شتانەوە دەبەستنەوە کە دەیزانن و دەیبینن ڕاستیش بێت، لە دیدی ئەوانەدا کە چاویان بە ڕووی مەعنا و حەقیقەتدا کراوەتەوە جگە لە فریوخواردن هیچی تر نییە.

***

ئەوانەی ئەمڕۆ هەوڵدەدەن دونیا تێکبدەن، بەراورد بەوانەی دەیانەوێت ڕێنکوپێنکییەکەی بپارێزن، وا دەردەکەوێت هەم زۆرتر بن و هەم خاوەنی کاریگەری زیاتریش بن. ئەگەر هێزێکی مەعنەویی وەها نەبێت کە کار لە هاوسەنگیی هێز بکات، لە حاڵی حازردا زەحمەتە بتوانرێت بوترێت کە چاکی و جوانی لە داهاتوویەکی نزیکدا مەودایەکی گەورە دەبڕن.

# ڕۆحە تاوانبارەکان

مرۆڤ زۆرجار لە چاویلکەی دڵی خۆیەوە، تەماشای کەسانی دیکە دەکات؛ بەهۆی ئەم و غوبار و دووکەڵیشەوە کە لێرەدا هەیە، هەموو شتێك و هەموو کەسێك بەلێڵی دەبینێت. ئەو بڕیارانەی کە لەم حاڵەتەدا دەیاندات، بەتەواوەتی تاریك و بێبەزەییانەن. ڕاستییەکەی خۆپەرستێك کە دووچاری

ماڵەتێکی لەم شێوەیە بووە، وادەزانێت هەموو شتێکی چواردەوری لەناوچووە؛ کەچی لەڕاستیدا ئەو شتەی لەناوچووە خودی خۆیەتی.

## ڕۆحە منداڵئاساکان

پێویستە ستایش و لوتف و ڕووتێکردنی گەورەکان بۆ ئێمە بە داخوازیی پێداویستی و هەژاریی خۆمان و نیشانەی گەورەیی ئەوان بزانین. پاشان ئەدەب و ڕێزی خۆمان بە هۆکاری بەردەوامییان بزانین و خۆمان لە بێباکی و بێپەروایی بپارێزین. هەتا نەکەوینە داوی شەتەحاتەوە و شێوەی منداڵێکی هارووهاج وەرنەگرین. وەیل بۆ ئەو ڕۆحە سەرگەردانە منداڵئاسایانەی کە بەخراپی کەڵك لە لوتف و چاکە و ڕووتێکردنەکان وەردەگرن!

# میللەت

ئەو ئاکانەی بەجددی بڕیاریان داوە ببن بە ستوونێکی باش بۆ میللەتەکەیان، ئەگەر لەم بیر و بۆچوونەیاندا ڕاستگۆبن بن، بەرژەوەندییەکانی خۆیان لەبیردەچێتەوە بەڵام بچووکترین بابەتی تایبەت بە میللەتەکەیان بۆ ساتێکیش لەبیر ناکەن.

***

پێشکەوتووترین میللەت ئەو میللەتەیە کە هەموو کاروبارەکانی لە چوارچێوەی یەکگرتن و بەکرێزیدا هەڵدەسەنگێنێت و قورسایی بە ڕای زۆرینە دەدات. بێگومان وەرگرتنی هەمان پەروەردە لە بابەتە گرنگەکانی وەك دین و زمان و مێژووی هاوبەش لەلایەن ئاکەکانی میللەتەوە شتێکی زۆر گرنگە.

***

ئەو شتەی کە زۆرترین چێژی لێدەبینین، پێویستە ئەو ڕەخنانە بن کە لەلایەن کەسانێکەوە ئاڕاستەمان دەکرێن کە خۆشماندەوێن و لە خۆشەویستییان دڵنیابین. ئەگەر وا نەکەین، هەروەك بەهۆی هەندێك لە کەموکورتییەکانمانەوە دۆستانێکی زۆر لەدەست دەدەین، بەهەمان جۆر دەرفەتی ڕاستکردنەوەی زۆرێك لە هەڵە و کەموکوڕییەکانیشمان بۆ فەراهەم نابێت.

***

یەکێکی دیکە لەو بابەتە هەرە گرنگانەی کە وەك میللەت گرفتاری

لاوازیمان دەکات، ساویلکەییمانە بەرامبەر بەو فێڵبازانەی کە خۆیان وەك دۆست دەردەخەن. ئەمە لەکاتێکدا دەبێت مرۆڤ بە هەموو بەڵێنێك نەخەڵەتێت و بڕوا بە هەموو ڕێنیشاندەرێك نەکات.

***

ئەگەر فێڵ و خەڵەتاندن لەناو تاکەکانی میللەتێکدا بە هونەر و زیرەکی ئەژمار بکرێت، مانای وایە ئەو میللەتە دووچاری دەردێکی بێدەرمان بووە. ئەو شتانەش کە وەکو نیشانەی باشی و چاکی لەم بونیاد و جەستەیەدا دەبینرێن، وەك ئەوە وایە ئازارسانی ئەندامەکانی نەخۆشێکی تووشبوو بە شێرپەنجە بە گەشەکردن و قەڵەوبوون دابنرێن.

***

ئەگەر لەنێوان گشت تاکەکانی میللەتێکدا پەیوەندییەکی وەك پەیوەندیی خێزانی بوونی هەبێت، لەسایەی ئەم پەیوەندییەدا قەدەر و چارەنووس ڕێگای ئەو میللەتە بەرەو ئاسۆی لوتکەکان تەخت دەکات. ئەو میللەتانەش کە تاکەکانی یەکتریان خۆشناوێت و لەدژی یەکترن و هەست بە سەلامەتی و متمانە ناکەن لەبەرامبەر یەکترەوە، هەروەك بە میللەتێکی ڕاستەقینە دانانرێن. داهاتوویەکی گەشیشیان نییە.

## گەنج

گەنج، ئەماسی هێز و توانا و زیرەکییە. هەتا پەروەردە بکرێت و بەرەو چاکەکاری ئاراستە بکرێت. هەرئێستەکە بەسەر سەختییەکاندا سەردەکەوێت و،

دەتوانێت ببێت بە هێزێکی وەها کە ڕووناکی بە دڵ و ڕێکوپێکی بە جیهان ببەخشێت.

***

کۆمەڵگا قاپێکی کریستاڵییە و گەنجەکانی ئاوێکی شلەیەکن تێیدا، شێوە و ڕەنگی ئەو وەردەگرن و لە ڕێگەی ئەوەوە دەردەکەون. نازانم داخۆ ئەو کاربەدەست و دەسەڵاتدارانەی کە هەمیشە گەنجان بەرەو گوێڕایەڵی و ملکەچی بانگ دەکەن، بۆ جارێکیش تەماشای خۆیان دەکەن؟!

***

هەوا و ئارەزووەکان لە شتی شیرین و فەزیلەتەکانیش لە چێشتی ترش و سوێر دەچن. ئەگەر گەنج سەربەست بکرێت لە هەڵبژاردنی یەکێک لەمانە. داخۆ پێویست دەکات بڵێین کامیان هەڵدەبژێرێت و کامیان وازلێدەهێنێت؟! ئەمە لەحاڵێکدا کە ناچارین گەنجان وەک دۆستی فەزیلەت و دوژمنی بێڕەوشتی پەروەردەبکەین.

***

هەتا ئەو کاتەی پەروەردە بە هانایەوە دەڕوات، گەنج لەو زینگەیەی تێیدا دژی پەروانەی چواردەوری هەوا و ئارەزوو و چێژەکانە و. شتێکە دوور لە زانست و بەسیرەت و لۆجیک دەسووڕێتەوە. پەروەردەیەکی باش کە گەنج لەگەڵ ڕابردووی خۆیدا ئاوێتە دەکات و بۆ ئایندە ئامادەی دەکات. دەیانکات بە عومەرەکانی ئایندە.

***

بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی میللەتێک پەیوەندییان بە ڕۆح و شعووری

ئەوە گەنجەکانی و، ئەو پەروەردە و فێرکردنەوە هەیە کە وەریدەگرن. ئەو میللەتانەی گەنجەکانی بەباشی پەروەردەکراون هەمیشە کاندیدن بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتن. لەبەرامبەردا دواکەوتنی ئەو میللەتانەی کە لاوەکانی خۆی پشتگوێخستووە شتێکی حەتمییە.



ئەوانەی دەیانەوێت سەبارەت بە داهاتووی میللەتێك پێشبینی و پێشگۆیی بکەن، ئەگەر تەماشای پەروەردەی لاوەکانی ئەو میللەتە بکەن لە بڕیارەکانیاندا لە سەدا سەد دەپێکن.

## گەنجێتی

دەربڕینی شەفەقەت و نەرمونیانی لەبەرامبەر ئەوە لاوەکاندا، هەنگاوێکی مانابەخشە لەسەر ڕێگای هەستاندنەوەی وڵات و میللەتەکەمان. ئەوەندە هەیە ئەم هەستی بەزەیی و میهرەبانییە ئەگەر ڕووی لە زیانی دڵ و ڕۆحیان بێت بەسوودە و. بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر ڕووی لە جەستە و لاشەیان بێت. زیانبەخشە و دەیانکات بە بوونەوەری جەستەیی و تەنانەت لەوانەیە لە شیرازەش دەریان بکات.



هەر میللەتێك گرنگی بە لاوانی خۆی دابێت پێشکەوتووە. ئەوانەش کە لە شەپۆلەکانی هەوا و ئارەزووی لاوێتیدا بەجێیان هێشتوون، زۆر بەقورسی باجی ئەم پشتگوێخستنەیان داوە. ئەگەر ئەمڕۆ ناپاکی چواردەورمانی

ئەنیوا و نەوەکان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لە سنوور دەردەچن، ئەمە بەتەواوەتی دەرئەنجامی پشتگوێخستنی ئێمەیە. بەڵێ، کاتێك سەرمان لەناو هەورەکاندا دەهات و دەچوو، هەستمان بەو مارانە نەکرد کە بەنێو قاچماندا هەتا ناو زۆری نووسینەکانمان دزەیان کردبوو و، بە دەستی خۆمان دۆخی ناهەمواری ئەمڕۆمان ئامادەکرد...

# هاوسەرگیری و خێزان

هاوسەرگیری بۆ حەز و چێژ نییە، بەڵکو ئامانج لێی پێکهێنانی خێزان و، مانەوە و بەردەوامیی نەتەوە و، ڕزگارکردنی بیر و هەستی تاك لە بەربڵاوی و ڕێکنەخستنی ئارەزووە جەستەییەکانیەتی. حەز و چێژەکان لەم ڕووەوە وەك هەر لایەنێکی تری سروشتی مرۆڤ بریتین لە پاڵنەرێك و کرێیەکی پێشینە.

***

پێویستە ئەوانەی بەنیازی هاوسەرگیرین، لەبری گرنگیدان بە بەژن و باڵا و، سەروەت و سامان و جوانیی دەرەکی، لەم بابەتە هەرە جددییەدا بەگرنگترین پێوەرەکانی وەك جوانیی ڕۆح و، جیهانبینیی ئەخلاق و ناموس و، فەزیلەت و، بەرزیی کەسایەتی بڕیاربدەن.

***

ئەو کەسانەی کە وردبینیی پێویستیان نەکردووە لە هاوسەرگیریدا یان دەرفەتیان بۆ رەها کارێك بۆ هەڵنەکەوتووە، بەداخەوە کاتێك کار دێتە سەر جیابوونەوە، نەبەی پێوەرە هەرە ژیرانەکانیش هیچ سوودێکیان نابێت. بەڵێ،

نامانج بریتی نییە لە ڕزگاربوون بە کەمترین زیان لەو ئاگرەی کە ماڵی تەنیوە، بەڵکو گرنگترین کار ئەوەیە کە هیچ شتێك نەبرێتەوە ناو ماڵەوە کە گومانی ئاگرکەوتنەوەی لێدەکرێت.

***

نابێت کچ بە کەسێك بدەین کە نایناسین و، کچانێکیش نەخوازین کە نایانناسین. نیکاحێك کە لەسەر شتانی نادیاری لەم جۆرە دامەزراوە، یان بە سەرەنجامێکی وەك تەڵاق کۆتایدێت کە خوای گەورە پێی ناخۆشە، یان سەبارەت بە لایەنەکان وەك ئەشکەنجەی لێدێت.

***

خێزانگەلێکی وەها پیرۆز هەن کە هەر لە یەکەم نیازەوە ڕەچاوی ڕەزامەندیی خوایان کردووە و لەسەر لۆجیك و داوەریی ژیری ژیانیان دامەزراوە بە درێژایی تەمەنێك ڕۆڵی قوتابخانە دەگێڕن و بەو شاگردانەش کە پێیان دەگەیەنن مانەوە و بەردەوامی بەو میللەتە دەبەخشن کە پێوەی پەیوەندیدارن.

***

ئەو هاوسەرگیری و کۆبوونەوانەی کە بەباشی بیریان لێنەکراوەتەوە، بە هاوسەری چاو بە فرمێسکی سەرگەردانی کوچە و کۆڵانەکان و، هەتیوگەلێك کە لە "خانەی بێسەرپەرشتان" فڕێدەدرێن و چەند کارەسات و دڕندەییەك کۆتاییان پێدێت کە جگەری تاکەکانی خێزان کون کون دەکەن.

***

ئەگەر سوودی هاوسەرگیری بۆ تاك یەك بێت، بۆ ئوممەت و نەتەوە هەزارە. لەم ڕووەوە تەرککردنی هاوسەرگیریش چەشنی هاوسەرگیریی ناتەندروستە.

کچان سەرگەردان و کوڕان پەرێشان دەکات و وەکو نەخۆشیی کۆلێرا ناو و خوێن لە جەستەی میللەتدا ناهێلێت.

***

ئەو خێزانەی کە هەر لە سەرەتاوە لەسەر بنچینەی بەهێز دامەزراوە و شەمالی بەختەوەریی ماددی و مەعنەویی تێدا دەشنێت، پتەوترین بەردی بناغەی بوون و مانەوەی میللەتە و قوتابخانەیەکی پیرۆزە بۆ پێگەیاندنی نەوەی چاکەکار و سوودبەخش. ئەو میللەتانەی کە ماڵەکانیان هێندەی قوتابخانەکانیان فەیز و بەرەکەتی تێدایە و خوێندنگاکانیشیان بەقەدەر ماڵەکانیان گەرم و نەرمە، گەورەترین بزووتنەوەی چاکسازییان ئەنجامداوە و ناسوودەیی و بەختەوەریی نەوەکانی داهاتوویان مسۆگەرکردووە.

***

نەتەوە لە یەکەی پێکهێنەری خێزان پێکدێت. لەم ڕووەوە ماڵەکان باش بن نەتەوە باشە و، ماڵەکان خراپ بن نەتەوەش خراپە. خۆزگە ئەوانەی چاکەی گەلیان دەوێت پێش لە هەر شتێکی تر هەوڵیان بۆ چاکسازیی خێزانەکان بدایە!..

***

بەگوێرەی مرۆڤەکانی ناوی، بە "ماڵ" دەوترێت "ماڵ". هەر ماڵێك دانیشتووانەکەی ڕێز لە بەها مرۆییەکان بگرن، بە بەختەوەر ئەژماردەکرێن. بەڵێ، دەتوانین بڵێین کە ئادەمیزاد بە پارەمەتیی ماڵەکەی دەتوانێت ژیانێکی مرۆڤانە بژی، خانووش بەگوێرەی مرۆڤەکانی ناوی دەبێت بە "ماڵ".

***

ماڵی ئەتەوەیەکی بچووکە و ئەتەوەش خێزانێکی مەزنە. ئەو کەسەی کە بە ڕێکوپێکی و بەبێ کەموکورتی خێزانێکی بچووک یان گەورەی بەڕێوەبردووە و تاکەکانی خێزانی بۆ مرۆڤایەتیی ڕاستەقینە بەرزکردووەتەوە، ئەگەر هەوڵێکی کەمێك زۆرتر بدات، دەتوانێت لە دامەزراوە گەورەتر و بەرزترەکانیشدا سەرکەوتوو ببێت.

* * *

ناڕێکوپێکی و بێسەروبەرەیی ناو خێزان دەربەدەری و پەرێشانیی ڕۆحی دانیشتووانی ئەو ماڵە و، شێواوی و پیسوپۆخڵی و ناڕێکوپێکیی ماڵ و دوکان و کۆڵانەکانی شارێکیش پلەی هەستکردنی فەرمانبەرانی شارەوانییەکەی دەردەخات.

# تەلاق

تەلاق بریتییە لە خۆداڕنینی تاك لە بەڵێننامە و قەیدی نیکاح. ئەگەر بەدەگمەن وەك شتێکی ناسوودمەخشیش دەربکەوێت، زۆربەی جار ناناسوودمی و بێنەوایی لەگەڵ خۆی دەهێنێت.

* * *

جیابوونەوە، لە دیدگای دیندا، بێزراوترینی موباحەکانە. ئەوەندە هەیە قەدەغەکردنیشی ناسروشتییە.

* * *

چارنووقاندن لەئاست ئەو ناچارییانەدا کە داخوازی تەلاقن، لە نەناسینی

ماهییەتی مرۆڤ و تایبەتمەندییەکانیەوە سەرچاوەدەگرێت. چاوەڕێکردنی گونجان لەنێوان هەموو ژن و مێردێکدا کە هاوسەرگیری دەکەن، نیشانەی ساویلکەییەکی وەهایە کە وا دەزانێت هەمووان وەك یەك خاوەنی هەمان سروشت و مەزاج و پێکهاتە و کەسایەتین.

***

هەموو تەڵاقێکی بێسەروبەر سەبارەت بە تەڵاقدەر پەشیمانییە و بۆ تەڵاقدراویش ناحەقییە و، بۆ تاکەکانی خێزانیش سەرچاوەی نائارامی و ناناسوودەییەکی وەهایە کە هەندێك جار بەدرێژایی تەمەن وەك برینێکی تازە ئازار و ژانەکەی بەردەوام دەبێت...

***

ئەگەر تەڵاق نەشتەرگەری بێت بۆ ئەندامێکی نەخۆش، بنیاتنانی هاوسەرگیری لەسەر بناغەی عەقڵی و لۆجیکی، خۆپاراستنی هەستیارانەیە بەرامبەر بە نەخۆشییەکان. لەبەرئەوە، پێش ئەوەی خێزان بە تەڵاق و، بەر لەوەی بە قەدەغەکردنی تەڵاق ویژدان وێرانبکرێن، پێویستە لە هاوسەرگیریدا گرنگییەکی زۆر بە گونجان بدرێت و هەرگیز شلگیری لەو هەلومەرجانەدا نەنوێنرێت کە ئەم گونجانە لە داهاتوودا پێکدەهێنن.

***

بەشێکی دونیا بەدرێژایی چەندین سەدەی دووروودرێژ بە قەدەغەکردنی تەڵاق یان بەستنەوەی بە چەندەها مەرجی سەخت و دەگمەنەوە، هەوڵی دا بەزۆر کەسانێك پێکەوە بهێڵێتەوە کە بیر لە ژیانێکی هاوبەش ناکەنەوە. بەشێکی دیکەی دونیاش وەك شتێك لە نافەرمی ڕوانی کە کەی ویستی

بپەیڤێتەوە و کەی ویستی دەری بکات. یەکێک لەمانە سزادانی پیاوە و، ئەوی دیکەشیان ئەژمارنەکردنی نافرەتە لە ڕیزی مرۆڤ.

## دایک و باوک

دایک و باوک دوو بوونەوەری پیرۆزی وەهان کە مرۆڤ لە پێش هەموو کەسێکی ترەوە ڕێزیان بگرێت. ئەو کەسەی لە ڕێزگرتنیاندا کەموکورتی بنوێنێت، مانای وایە ڕوویەڕووی خوا بووەتەوە. ئەو کەسەی ئەوان ئازار بدات، زوو یان درەنگ ئازار دەدرێت.

***

مرۆڤ، لەو ڕۆژەوەی کە هێشتا زیندەوەرێکی گچکەیە، هەردەم وەکو بارێک لەسەر شانی دایک و باوکییەتی. لەم ڕووەوە نە دەکرێت قووڵیی میهرەبانیی دایک و باوک بەرامبەر بە ڕۆڵەکانیان بپێورێت و، نە سنووری ئەو ناڕەحەتی و ئازارەش کە لەپێناویان دەیکێشن دیاری دەکرێت. هەربۆیە ڕێزگرتنیان هەم قەرزێکی مرۆڤایەتییە و هەم ئەرکی ئەستۆیە.

***

ئەوانەی نرخی دایک و باوکیان دەزانن و بە هۆکاری گەیشتن بە ڕەحمەتی خوای گەورەیان دادەنێن، هەم لەم دونیا و هەم لەو دونیا لە ڕیزی هەرە بەختەوەرەکانن. ئەوانەش کە بوونی ئەوان بە بارگرانی دەزانن و بێزارییان لەبەرامبەردا دەردەبڕن، کۆمەڵێک بەدبەختی وەهان کە جەفا و ناڵینێکی زۆریان لە ڕێگادایە.



مرۆڤ بەئەندازەی ڕێزی بەرامبەر بە دایك و باوكی، ڕێزدارە بەرامبەر بە بەدیهێنەرەكەی. ئەوەی ڕێز لەوان نەگرێت، بەرامبەر بە خواش بێڕێزە. لەم ڕۆژگارە نامۆیەی ئێستادا نەك تەنها ئەوانەی بەرامبەر بە خوا بێڕێزن بەڵكو ئەوانەش كە بانگەشەی خۆشەویستنی خوا دەكەن بەبەردەوامی بێڕێزی بەرامبەر بە دایك و باوكیان دەنوێنن.



پێویستە منداڵ ئەوپەڕی ڕێز و گوێڕایەڵی لەبەرامبەر دایك و باوكییەوە بنوێنێت. لەبەرامبەردا ئەوانیش پێویستە بەئەندازەی گرنگیدانیان بە لایەنە جەستەییەكەی، گرنگی بە ژیانی دڵ و ڕۆحیشی بدەن و، هەرچی زووە تەسلیمی پەروەردە و فێركردنی كارامەترین حەكیمەكانیان بكەن. ئەو دایك و باوكەی دڵ و ڕۆحی منداڵەكەیان لەبیر دەچێت چەند نەزانن و، ئەو منداڵەش كە دەبێت بە قوربانی نەزانییەكی لەم جۆرە چەند بەدبەختە!



ئەو منداڵەی مافی دایك و باوكی ڕەچاو ناكات و سەرپێچیان دەكات "جانەوەرێكە لە شێوەی مرۆڤدا" و، ئەو دایك و باوكانەش كە بێبەشن لە هەوڵی گەرمتێكردنی ژیانی مەعنەویی منداڵەكانیان كۆمەڵێك ستەمكاری بێبەزەیین. بەتایبەت ئەو دایك و باوكانەی كە هەوڵدەدەن منداڵەكانیان ئیفلیج بكەن لەدوای ئەوەی كە ڕێگای پەر و باڵ و فڕینیان دۆزیوەتەوە!



خێزان یەكەی سەرەكیی كۆمەڵگایە. تاكەكانی ناو خێزان چەند ڕێز لە

ئەرك و مافی یەکتر بگرن، کۆمەڵگاش ئەوەندە پتەو و تەندروست دەبێت.
ئەگینا گەڕان لەنێو کۆمەڵگەدا بەدوای ئەو ڕێز و میهرەبانییەی لە خێزاندا
ونبووە لەناو کۆمەڵگادا کارێکی بێهوودەیە!

## منداڵ

ناوك و تۆو بۆ بەردەوامیی جۆر و نەوەی درەختەکان چەند گرنگە،
منداڵیش خاوەنی هەمان گرنگییە لە بەردەوامیی نەوە و ڕەگەزی مرۆڤدا.
ئەو میللەتانەی کە منداڵەکانیان فەرامۆشدەکەن مەحکوومن بە لێکهەڵوەشان
و ئەوانەش کە ڕادەستی بێگانە و کلتووری بێگانەیان دەکەن، مەحکوومن بە
لەدەستدانی خود و ناوەرۆکی خۆیان.

***

منداڵانی ئەمڕۆ دوای سی بۆ چل ساڵ دەبن بەو گەنجانەی کە چالاکترین
و پڕبەرهەمترینی چینی کۆمەڵگان. ئەوانەی کە منداڵ بە بچووك و بێنرخ
تەماشادەکەن پێویستە بیر لەوە بکەنەوە کە چ کۆڵەکەیەکی گرنگی ژیانی
میللەتیان فەرامۆشکردووە و دەبێت مووچڕکە بە گیانیاندا بێت.

***

ئەو خراپییەی کە لە نەوەکانی ئەمڕۆدا دەبینرێت و، ئەو نەبوونی توانا
و لێهاتن و شایستەییەی کە لە هەندێك لە بەرپرسانی... دەبینرێت و، ئەو
نەهامەتییانەی کە بەسەر نەتەوەکەماندا دێت، بەرپرسیارێتییەکەی لە ئەستۆی
دەسەڵاتداران و پەروەردەکارانی سی ساڵ لەمەوپێشدایە. سەرجەم کارەسات

یاخود چاکەکارییەکانی پازدە ساڵ دوای ئێستاش لە گەردنی ئەوانەدایە کە پەروەردە و فێرکردنی نەوەکانی ئەمڕۆ دەبەن بەڕێوە.



هەر نەتەوەیەک بیەوێت داهاتووی خۆی مسۆگەر بکات، پێویستە بەشێک لەو سەرمایەیەی کە بە ڕاست و چەپدا بەفیڕۆی دەدات، وەکو وەبەرهێنانێک بیخاتە خزمەتی پەروەردەکردنی منداڵانی ئەمڕۆ کە گەورەپیاوانی سبەینێن. ئەگەر زۆربەی زۆری ئەو شتانەی کە لە بوارەکانی تردا سەرف دەکرێن بەفیڕۆش بچن، هەرگیز ئەو شتانەی کە بە ئاڕاستەی بەرزکردنەوەی نەوەکان بۆ مرۆڤایەتیی ڕاستەقینە سەرفکراون بەخۆڕایی ناڕۆن و چەشنی کانیاوێکی هەمیشەیی بەردەوامدەبن.



ئەو زەبوون و، خراپەکار و، گێرەشێوێن و، تیرۆریست و، سەرخۆش و، تلیاککێشانەی ئەمڕۆ کە بە پەڵەی نێوچاوانی کۆمەڵگا دادەنرێن، هەمان ئەو منداڵانەی دوێنێن کە کەمتەرخەمیمان لە پەروەردەکردنیاندا نواندووە. نازانم داخۆ بیرمان لەوە کردووەتەوە کە سبەی لە ئەنجامی کەمتەرخەمییەکانی ئەمڕۆماندا چ جۆرە نەوەیەک شەقام و کوچەکانمان پڕ دەکەن؟



ئەو میللەتانە باڵادەست دەبن بەسەر قەدەری داهاتوودا کە مامەڵەی جددی لەگەڵ دامەزراوەی هاوسەرگیریدا دەکەن و دەزانن چۆن نەوەکانیان بەرزبکەنەوە بۆ ئاستی بەرزی مرۆڤایەتی، نەک ئەوانەی کە خاوەنی زانست و، تەکنیک و تەکنەلۆجیان. ئەو نەتەوانەش کە بەجددی لە هاوسەرگیری و منداڵبوونیان

نەڕوانیوە و بە فەلسەفەی پەروەردەی خۆیان نەوەکانیان گۆش نەکردووە، ئەگەر
ئەمڕۆش نەبێت بێگومان سبەی، مەحکوومن بەوەی لەژێر چنگ و ددان
تیژەکانی زەمانەدا وردوخاش ببن.

## مافەکانی منداڵ

ئادەمیزاد، لەگەڵ هاوڕێی ژیانیدا بەدیهێنراوە. ئەو کاتەی بەتەنها
دەمێنێتەوە هێندە کەمە کە لە حوکمی نەبوودایە. ئەمەی کە هەر لە سەرەتای
بوونیەوە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بەدیهێنراوە، نیشانی دەدات کە هاوسەرگیری
سەبارەت بە مرۆڤ شتێکی فیترییە. گرنگترین ئامانجیش لەم ئەرکە
سروشتییەدا "خستنەوەی وەچە"یە. بەرمەبنای ئەمە، ئەو هاوسەرگیرییانەی
کە ئامانج تیایاندا پەروەردەکردنی نەوەکان نییە ڕابواردن و سەرکێشییە و، ئەو
منداڵانەش کە لە وەها هاوسەرگیرییەک دەکەونەوە. کۆمەڵێک بەدبەختی وەهان
کە بوونەتە قوربانیی هەستێکی کاتی.



ئەوەی مرۆڤ تەنها بە مرۆڤی ڕاستەقینە بەردەوام دەبێت. مرۆڤێک کە
بەرەو ئاسۆی ژیانی دڵ و ڕۆح باڵی گرتووە... ئەو ئەوانەی کە پەروەردەیان
نەبینیوە و، توانا ڕۆحییەکانی خۆیان پێشنەخستووە و بەم هۆیەشەوە
نەیانتوانیوە بەرزببنەوە بۆ مرۆڤایەتیی ڕاستەقینە. ئەگەرچی لە نەوەی
ئادەمیش بن. لە ڕاستیدا کۆمەڵێک بەدیهاتووی قەبە و ناقۆڵای وان کە تەنها
بەرواڵەت لە مرۆڤ دەچن و. ئەو دایک و باوکانەش کە بەخێوکردنیان دەگرنە

ئەتۆ، دەستەیەك بەدبەختی وان کە لە باوەشیاندا جانەوەر گۆش دەکەن.

***

دایکان و باوکان بە ئەندازەی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان و بەخشینی فەزیلەت بە کەسایەتییان مافی ئەوەیان هەیە کە بە "رۆڵەکەمان، جگەرگۆشەکەمان" بانگیان بکەن. بۆیە هەرگیز ناکرێت ئەو دایك و باوکانەی کە پەروەردەی منداڵی خۆیان پشتگوێخستووە، هەمان بانگەشە بکەن. بەتایبەت ئەگەر رێگای خراپ و ناشرینی نیشان بدەن و لە مرۆڤایەتی دووری بخەنەوە...

***

مانەوە و بەردەوامیی میللەتێك بەندە لەسەر نەوەگەلێکی باش پەروەردەکراو. نەوەگەلێك کە بوون و رۆحی میللیی تێدا کامڵە... ئەگەر نەتەوەکان نەوەیەکی وا نموونەییان پێنەگەیاندبێت کە داهاتووی خۆیانیان پێبسپێرن، مانای وایە ئایندەیان گوماناوی و تاریکە. هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە لە پەروەردەکردنی نەوەیەکی باشدا ئەرکی یەکەم دەکەوێتە سەر شانی دایك و باوك.

***

ئەگەر دایك و باوك بەوردی پەروەردەی منداڵەکانیان بکەن و، بیر و هەستەکانیان بە ئاراستەی قازانجی خۆیان و کۆمەڵگاکەیان بخەنە کار، ئەوا بناغە و کۆڵەکەیەکی نوێ و پتەو پێشکەش بە کۆمەڵگا دەکەن. بەپێچەوانەوە، گەر لەسەر ئاستی هەستە مرۆییەکانیان پشتگوێیان بخەن، ئەوا وەك ئەوە وایە کە دڕندە و جرجانەوەریان لە گیانی کۆمەڵگا بەردابێت.

***

هەتا ئەو کاتەی درەخت خزمەتی بکرێت و ئاژەڵیش چاودێری بکرێت و

نیماریکرێت، هەم مێوە و بەرووبوومیان دەبێت و هەم بەردەوامی بە ڕەگەزی خۆیان دەدەن. بەڵام گەر خزمەتنەکرێن و بەخێونەکرێن، درەخت زەرو ناژەڵیش بێبەرهەم دەبێت. ئەی ئەو مرۆڤەی کە بە هەزار و یەک توانا و لێهاتنەوە ڕەوانەی دونیا کراوە؟ ئایا نابێت هیچ نەبێت بە ئەندازەی درەختێك پەروەردە بکرێت؟

***

ئەی ئادەمیزاد، تۆ منداڵت هێناوەتە دونیا! ئەرکی بەرزکردنەوەشی بۆ ئەودیوی ئاسمانەکان دیسان هی تۆیە. هەرەوەك گرنگی بە تەندروستیی لاشەی دەدەیت. لەبەر خاتری خوا بەزەییت بە ژیانی دڵ و ڕۆحیشیدا بێتەوە، ئەو بێچارەیە ڕزگاربکە و مەهێڵە بە هیچ و خۆڕایی بەفیڕۆ بچێت!

## ئەخلاق

بوون بە زانا شتێکە و بوون بە مرۆڤیش شتێکی دی. کاتێك زانا بە خۆی و زانستەکەیەوە دەچێتە ژێر فەرمانی مرۆڤێتی و، بەئەندازەی نوێنەرایەتیکردنی زانستەکەی لە ڕێگەی ئەخلاق و فەزیلەتەوە لە حەماڵیی زانین و زانست ڕزگاری دەبێت و دەگات بە پایەی مرۆڤێکی بەرز. ئەگەر پێچەوانەی ئەمە بێت مانای وایە لەگەڵ داماوێکدا کە تەمەنی بەفیڕۆداوە جیاوازییەکی نییە.

***

ئەگەر بشتخەڵەتێنن، ئەکەی کەس بخەڵەتێنیت! جگە لەمە، هەرگیز

لە ڕاستگۆیی و ڕاسترەوی کە لە گەورەترین فەزیلەتەکانن لامەدە، ئەگەر هەندێکجار ببن بە هۆکاری مەحرومبوون و دۆڕانیش!

***

ئەمڕۆدا چیدی ئەخلاق وەکو سەردەمانی پێشتر بە تێکڕای فەزیلەتەکان دانانرێت. بەڵکو خەڵکی ئەم ڕۆژگارە دەیەوێت تەنها لە چوارچێوەی ئەزاکەت و پەروەردە و ئەتەکێتی کۆمەڵایەتیدا لێی تێبگات. هیچ نەبێت خۆزگە لە هەموو کەسێکدا ئەمەشمان دەدی!

***

ئەخلاق، سەبارەت بە هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ کۆمەڵێک دەستووری بەرز لەخۆدەگرێت کە هەموویان لە بەرزیی ڕۆحەوە سەرچاوەدەگرن. بەرمەبنای ئەمە دەتوانین بڵێین ئەوانەی نایانتوانیوە لەگەڵ ڕۆحی خۆیاندا ناڕتەببن، زەحمەتە بۆ ماوەیەکی درێژ نمایندەیی یاسا ئەخلاقییەکان بکەن.

***

پێشتر خەڵکی دەیانوت "ئەخلاق تەنها لە کتێبەکاندا ماوەتەوە." ئێستا دەڵێن "لە کتێبە کۆنەکاندا ماوەتەوە." ئەگەر واش بێت، ئەم شتە بەنرخەی کە دەویسترێت بەزۆر کۆن بکرێت، چەندین شتی "تازە" هەن کە شایانی ئەوەیە بکرێن بەفیدای.

***

بەختکردنی بەرژەوەندییە کەسییەکان لەپێناوی بەرژەوەندیی کەسانی تردا، بەرزیی ڕۆح و جوامێرییە. ئەوانەی بەبێ چاوبڕینکردنی هیچ جۆرە بەرژەوەندییەک بەبەردەوامی چاکە دەکەن، کاتێک لە کات و شوێنێکی

چاوەڕوانەکراودا ڕوویەڕووی بیر و کردارە چاکەکانی خۆیان دەبنەوە، هاوڕێ لەگەڵ سەرسامی و سەرسوڕماندا، زەردەخەنە دەبارێتە سەر ڕووی خۆیان و چاوەنوسیشیان.

## فەزیلەت

هەمیشە بەدوای شەرەف و پلەوپایەی نوێدا بگەڕێ بۆ ئەو ڕۆحەت کە هەتا ئەبەد بەردەوام دەبێت! هەمیشەش لە هۆشیاری و ئامادەباشیدا بە بۆ پاراستن و نەدۆڕاندنی ئەو شەرەفانەی بەدەستت هێناون!

***

ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا گرنگی بە گەشە و نەشونماکردنی کەسە خراپ و خراپکارییەکان نەدرێت و، کەسە باش و کردارە جوانەکان وەك تاوانبار مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت و، عاشقانی حەقیقەت و فەزیلەت ڕووبەڕووی سووکایەتی و ئازار بکرێنەوە و، ئانەخلاقی بەناسانی سەر بە گشت جێیەکدا بکات، سەبارەت بەوانەی کە لەپێناو فەزیلەتدا دەژین ژێر خاك باشترە لە سەر خاك.

***

فەزیلەت بەو ڕەفتارانە وتراوە کە مرۆڤەکان بەرزیان دەرخێنن و ئاژەڵان حەزیان لێناکەن و، ناوی ڕەزیلەتیش لەو هەڵسوکەوتانە نراوە کە مرۆڤەکان سڵیان لێدەکەنەوە و لێیان دووردەکەونەوە و ئاژەڵان بەبێ گوێپێدان ئەنجامی دەدەن. ئەمەش پێناسەیەکی تەواو گونجاوە.

***

خۆشەویستیی توند بەرامبەر بە چەمکە باڵاکانی وەك دین و میللەت و نیشتمان و دەوڵەت، کاری ڕۆحە جوامێر و دلێرەکانە. ئەوان ئەم ڕاستییە بەرزانە پایەماڵ ناکەن و ناهێڵن کەسیش پایەماڵیان بکات، ئەگەر پێویستیشی کرد ئامادەن لەو پێناوەدا بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە گیانی خۆیان بەختبکەن. ئەو بەدبەختانەش کە لە ڕۆحێکی بەرزی لەم شێوەیە بێبەشن، ئەم کارەی ئەوان بە شێتی ناو دەبەن.

***

فەزیلەت، ئەگەر لە هەندێك حاڵەت و هەلومەرجیشدا بێتە بە هۆکاری هەندێك زیان، دیسان هەر فەزیلەتە. تەماشاکردنی بەسووکی و پەشیمانبوونەوە لێی، هەمیشە ناحەقییە. ئەو زیانانەش کە بەهۆی فەزیلەتەوە ڕوو لە مرۆڤ دەکەن، پێویستە دیسان لەڕێگەی فەزیلەت هەڵبگیرێن و لەناوببرێن.

***

فەزیلەت بریتییە لە گرنگی نەدان بە ڕێز و حورمەتێك کە تەواوە و مافی کەسەکە خۆیەتی، بەڵام غرور بریتییە لە حاڵەتی ڕۆحیی کەسێك تەنانەت لەو جێیانەشدا کە مافی نییە داوای ڕێز و ستایش دەکات. کاتێك فەزیلەت دەکەوێتە گۆ، غرور پەنا بۆ سینەی مێتی دەبات و بەدەم ناڵینەوە گری دەگرێت.

***

یادکردنەوەی پێشینانمان بە خێر هەم مافی ئەوانە و هەم نیشانەی قەدرشناسیی ئێمەیە، چونکە ئەوان وەکو ئەو ڕەگانە وان کە ڕەسەنێتی

بە میللەت دەبەخشن، هەوڵدان بۆ وشککردنی ئەوان بە مانای ترساندن و دوورخستنەوەی میللەت دێت لە ڕابردووە شکۆدارەکەی.

***

ئەوانەی کەسانی ناوبانگ باش بەرزدەکەنەوە و یادی بەخێریان دەکەن بەدڵنیاییەوە ڕۆژێك دێت کە بەخێر یاد دەکرێنەوە. ئەوانەش کە دەیانەوێت بە ڕەخنەگرتن و تانەدان لە ناوبانگی کەسانی دی ناوبانگ دەربکەن، ناوبانگێکی زۆر خراپ بەدەستدەهێنن...

***

خۆناسین بەسیرەتە و خۆبینینیش کوێرییە. ئەو کەسەی خۆی دەناسێت هەم لە خوا و هەم لە خەڵکەوە نزیکدەبێتەوە؛ وەلێ ئەو کەسەی خۆی دەبینێت، جگە لە خۆی لە هەموو شتێکی تر دووردەکەوێتەوە.

***

هەڵسەنگاندنی هەڵەکانی ڕابردوو و وەرگرتنی سوود لێیان و، تا ئەندازەیەك لێخۆشبوون لە خەڵکانی ڕابردوو و سەرقاڵنەبوون پێیانەوە، ڕەفتارێکی ژیرانەیە. تاوانبارکردنی نابەجێی ڕابردوو و دانیشتووانەکەشی جۆرێك لە گەمژەییە.

## پەروەردە

قسەیەك لەناوماندا باوە دەڵێت "منداڵ ئازیزە، بەڵام پەروەردە ئازیزترە." وتەیەکی چەند بەجێیە.

•••

پێویستە دایك و باوك لە پەروەردەکردنی منداڵدا وەك کەسانێك وابن کە پەرێزیم دەکەن و، لە پەروەردەدا زۆر بەباشی ڕەچاوی پێوەرەکان بکەن.

***

مادەم خوار تەمەنی پێنج ساڵی کراوەترین قۆناغی نەستی(لاشعور)ی منداڵە، کەواتە لەم قۆناغەدا پێویستە هەموو هەوڵێك بۆ پیشاندانی نموونەی باش بە منداڵەکان بخرێتە گەڕ.

***

داهاتووی هەموو کەسێك ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە کاریگەریی سەردەمی منداڵی و گەنجێتیی ئەو کەسەوە. ئەگەر منداڵان و گەنجان لە ژینگەیەکدا پەروەردەبن کە بە هەست و ئەستە بەرزەکان بجۆشێن. ئەوا لەڕووی حاڵەتی زیهنی و فیکرییەوە زیندوو و لە ڕوانگەی ڕەوشت و فەزیلەتیشەوە پاڵێوراون بۆ ئەوەی ببن بە نموونەی چاولێکراو.

***

مرۆڤ، بە ئەندازەی دووربوونی هەستەکانی لە شتە نزمەکان مرۆڤە. ئەو کەسانەی کە دڵیان لەژێر فشاری هەستە خراپەکاندایە و ئەفسانییەتیش چنگی لە ڕۆحیان گیرکردووە، ئەگەر بە ڕواڵەتیش لە مرۆڤ بچن، لە ناوەرۆکدا گۆڕاون بە شتێکی تر. هەموو کەسێك ئەو بەشەی پەروەردە دەزانێت کە پەیوەندیی بە جەستەوە هەیە. بەڵام ژمارەی ئەوانە زۆر کەمن کە لە پەروەردەی فیکر و هەستەکان تێدەگەن و لە ڕاستیدا ئەمەش بناغەکەیە. ئەمە لەحاڵێکدا پەروەردەی جۆری یەکەم جەستەی خاوەنماسولکەی بەهێز و، جۆری دووەمی پەروەردە مرۆڤی خاوەن ڕۆح و مەعنا بەرهەمدەهێنن.

***

خزمەتکردن بە چاکسازی میللەتێک بەوە دەبێت کە نەوەکانی بە کلتور و پەروەردەی میللی بۆ ئاستی مرۆڤایەتی ڕاستەقینە بەرزبکرێنەوە، نەک بە لەناوبردنی خراپەکارەکانی ناوی. هەتا تۆوێکی پیرۆز کە لە تێکەڵەی دین و، شعووری مێژوو و دابونەریتەکان پێکدێت لە هەر چوار لای نیشتماندا نەچێنرێت، لەگەڵ هەڵکێشانی هەر خراپەیەکدا چەند دانەیەکی نوێ لە جێگایدا دەڕوێن.

***

ئەو کتێبانەی کە بۆ خوێندنەوە دەخرێنە بەردەستی منداڵان، ئیدی شیعر بن یان پەخشان، پێویستە بەجۆرێک بن کە هێز بە بیر و، خۆگری بە ڕۆح و، بەرەکەت و پیت بە هەوڵ و هیوا ببەخشن؛ هەتا نەوەی خاوەن ئیرادەی بەهێز و فیکری پتەو پێبگەن...

***

پێویستە لە پەروەردەکردنی منداڵە کچەکان لەو ڕووەوە کە دایکانی سبەینێن، وەکو گوڵ مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت و شێوەیەکی ناسک و نیان و میهرەبانانە بکرێت بە بناغە. بەڵام لە ڕوانگەی لایەنگرتنی حەق و سەرخستنیەوە پێویستە وەک پۆڵا وابن. ئەگینا لەپێناو ناسکی و نەزاکەتدا، دەیانکەین بە کۆمەڵێک داماوی دەست و پێ سپی و هەژار.

***

پەروەردە خۆی لە خۆیدا جوانییە و لە هەر کەسێکدا هەبێت شایانی ڕێزلێنانە. کەسی خاوەن پەروەردەی جوان ئەگەر نەزانیش بێت خەڵکی خۆشیاندەوێت. ئەو

میللەتانەی کە لە کلتوور و پەروەردەی میللی بێبەشن، لەو کەسە بێبەز و، نەزان و سەرسەرییانە دەچن کە نە لە دۆستایەتییاندا وەفا و نە لە دوژمنایەتییاندا جددییەت هەیە. ئەوانەی کە متمانە بە کەسانی لەم جۆرە دەکەن، هەمیشە تووشی نائومێدی دەبن و، ئەوانەش کە پشتیان پێ بەستوون بێ پشت و پەنا دەمێننەوە.



ئەو ژن و پیاوە پەروەردەکارانەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان شاگردێتیی مامۆستایەکیان نەکردووە و لە سەرچاوەیەکی بەهێزەوە پەروەردەیان وەرنەگرتووە، وەک ئەو کوێرانە وان کە چرایان بۆ ڕێگای کەسانی تر هەڵگرتووە. بێشەرمی و بێڕوویی منداڵ لە لێڵیی ئەو کانیاوەوە سەرچاوەی گرتووە کە پێی گۆش بووە. تارێکیی بیر و هەست و جووڵە لە خێزاندا دوو چەندانە لە ڕۆحی منداڵدا ڕەنگدەداتەوە. بێگومان لەوێشەوە بۆ کۆمەڵگا...



پێویستە لە قوتابخانەکاندا بەلایەنی کەمەوە بەئەندازەی وانەکانی تر گرنگیش بە پەروەردە و کلتووری میللی بدرێت، بۆ ئەوەی ڕۆحی ساغڵەم و کەسایەتیی پتەوی وا پێبگەن کە نیشتمان بکەن بە گۆشەیەک لە گۆشەکانی بەهەشت. پەروەردە جیاوازە لە فێرکردن. لەوانەیە زۆربەی خەڵکی بتوانن ببن بە مامۆستا، بەڵام زۆر کەمیان دەبن بە پەروەردەکار.



کلتوور و پەروەردەی میللی کەمترین گرنگیی پێدەدرێت لەنێو وانەی قوتابخانەکاندا. لەکاتێکدا لە هەموو شتێکی تر پێویستترە. ئەگەر ڕۆژێک

برِیاری کارکردن بەم شێوازە بدەین، مانای وایە باشترین هەنگاومان ناوە بە ناڕاستەی پێشخستنی وڵاتدا.

***

شاعیر، بە شاعیری لەدایکدەبێت. ئیمرولقەیس هەرگیز قوتابخانەی نەدیوە. ئەنیشتاین لە خوێندنگا ڕایکردووە. چونکە بیرکردنەوەی جیاوازبوو. نیوتن لە ماتماتیکدا دەرنەچووە، بەڵام تیۆرییەکەی لەسەر ماتماتیک بنیاتناوە. ئێمە، هەوڵدەدەین چێشتی ناو مەنجەڵی خەڵك بە کەوچکی خۆمان تێکومربدەین.

***

یەکەم خوێندنگای ئەو منداڵانەی کە ڕۆحیان هێندەی ناوێنەکان ڕوونە و بەئەندازەی کامێرەکان خێران لە تۆمارکردنی شتانی چواردەوریاندا، لە ماڵی خۆیانەوە و یەکەم پەروەردەکاریشیان دایکیانە. پێگەیاندنی دایکان وەك پەروەردەکارێکی باش لەبری ئەوەی لەملاولادا بەفیڕۆبچن، گرنگترین بناغەی بوون و مانەوەی میللەتێکە.

## ئامۆژگاری

ئامۆژگاری، کوڵەکەی سەرەکی دینداریە.

***

ئەگەر ئامۆژگاری بێسوود بووایە، هەرگیز خوای گەورە پێغەمبەرانی دەنارد؟!

***

ئامۆژگاری هۆکارێکە مرۆڤ بە خێرەکان دەگەیەنێت؛ هۆکاری خێر خێرە و بەرهەمەی خێرەکە پاداشتەدەرێتەوە.

***

دەبێت کەسی ئامۆژگاریکار پێش لە هەر کەسێکی دی ئەو شتانە لە خۆیدا هەبن کە دەیانڵێت، هەتا متمانەبەخش و باوەڕپێکراو بێت. بەڕای من پێویستە لەمەدا بەدوای کاریگەریی دەرنی و ناکاریگەریی ئەمڕۆدا بگەڕێین.

***

ئەوانەی شوێن ڕابەری کوێر کەوتوون، ئەگەر لەبری هەنگاونان لە جێی خۆیاندا بوەستن، لە ئامانجەکەیان نزیکترن.

***

کلیلی دڵەکان کردار و گوفتاری ئەرمونیانە.

***

وتاربێژ ئەو کەسەیە کە پێکەوە هەموو ئامادەبووان دەبینێت و کۆنترۆڵیان دەکات.

***

هەمیشە ڕوونکردنەوە و باسکردنی شتێك لەڕێگەی کردارەوە کاریگەرتربووە لە باسکردنی بە گوفتار.

***

بەنەرمی قسەبکە، هەتا دەرگای دڵەکان بکرێنەوە و ویژدانەکان "فەرموو"

لە بۆچوونەکانت بکەن، ڕەچاوی ئیخلاص بکە لە کاروبارەکانتدا، هەتا کاریگەریت بەردەوامبێت!

***

کاتێك هەموو وتەکانت بەخۆڕایی لە هەوادا دەمێننەوە، لەوانەیە تاقیکردنەوەی لۆمەکردنی دوژنراوەکانت بە چاکەکردن لەگەڵیان شتێکی باش بێت...

***

خێری گەورەتر لە خێر و، شەڕی گەورەتریش لە شەڕ هەن.. تەنها کەسانی ژیر و نموانەی کە کراوەن بە ڕووی ئیلهامدا دەزانن کەی کامیان هەڵبژێرن.

# ڕاوێژ

ڕاوێژ، یەکەم مەرجی ڕاست و دروستیی ئەو بڕیارانەیە کە دەردەکرێن. ئەو بابەتانەی بەباشی بیریان لێ ناکرێتەوە و، ئەو بڕیارانەی پێش وەرگرتنی ڕا و بۆچوون و ڕەخنەی کەسانی تر دەردەکرێن، زۆرجار بە شکست و دۆڕان کۆتاییان دێت. کەسێکی خۆبەخۆ کە لە بیرکردنەوەدا داخراو بێت و ڕێز لە بیروبۆچوونی کەسانی دی نەگرێت، ئەگەر خاوەنی سروشتێکی باڵا، تەنانەت بلیمەتیش بێت، بەراورد بە کەسێك کە لە هەموو بیر و کارێکیدا ڕاوێژ دەکات، کەمتر بەهەڵەدا دەچێت.

***

ژیرترین کەس ئەو کەسەیە کە ڕێزێکی زۆر لە ڕاوێژ دەگرێت و زۆرترین

سوود لە فیکری کەسانی تر وەردەگرێت. ئەو ڕۆحە کاڵوکرچانەی کە لە کارەکانیاندا بیرکردنەوەی خۆیان بەلاوە سەروزیادە و، تەنانەت زۆر لە خەڵکیش دەکەن و بەسەریاندا دەیسەپێنن، چواردەورەکەیان هەمیشە نەفرەت و بێزیان لێدەکەنەوە.



هەروەک یەکەم مەرجی بەدەستهێنانی ئەنجامی جوان و باش ڕاوێژە، یەکێک لە هۆکارە گرنگەکانی خۆپاراستن لە سەرەنجامی خراپ و ژێرکەوتنیش، فەرامۆشنەکردنی سوودوەرگرتنە لە فیکری بەرزی دۆستان و خۆشەویستان.



پێویستە پێش دەستدانە هەر کارێک ڕاوێژی پێویست ئەنجامبدرێت و کەموکوڕی لە نەخشەکێشانیدا نەکرێت. هەتا لە ئەنجامدا مرۆڤ ڕێی لە ڕێگە هەڵەکانی وەک تاوانبارکردنی چواردەور و ڕەخنەگرتن لە قەدەر کە بەلا و موسیبەتەکە دووچەندانە دەکەن هەڵنەکەوێت. بەڵێ، ئەگەر پێش هەستان بە کارێک بەجوانی بیر لە دەرەنجامەکەی نەکرێتەوە و ڕاوێژ بە کەسانی خاوەن ئەزموون نەکرێت، خەیاڵشکان و نائومێدی و پەشیمانی سەرەنجامێکی حەتمی دەبن.



چەندین کار هەن کە بێ بیرکردنەوە لە پێش و دوای دەستیان دراوەتێ. خاوەنەکانیان نەک هەر نەیانتوانیوە هەنگاوێک بەرەو پێشی ببەن، بەڵکو لە ئەنجامدا بوون بە هۆکاری نەمانی متمانە و ناوزڕانی خاوەنەکانیشیان. بەڵێ، کەسێک هەر شتێک بە خەیاڵیدا هات جێبەجێی بکات، بەهۆی ئەو

خەیاڵشکانانەوە کە لە ئەنجامی ڕێگا هەڵەکانەوە تێیان دەکەوێت، تەنانەت لەو شتانەشدا کە لە ئاستی توانا و وزەیدان و دەتوانێت تێیاندا سەرکەوتوو بێت، زوو یان درەنگ دووچاری نائومێدی دەبێت.

***

پێویستە مرۆڤ هەرگیز ئەو دەرگایانە نەکاتەوە کە لە داخستنیان دەستەوسانە. چونکە ئەو شەڕ و دێو و درنجانەی لەو دەلاقانەوە دزە دەکەنە ژوورەوە کە کراونەتەوە، هەم زیان لە کەسانی دی دەدەن و، هەم نابڕووی خاوەنەکەشی لەگەڵ خۆیان دەبەن. چەندین کەسی وا هەن کە سەرەڕۆیانە و بەبێ ڕاوێژکردن بە ڕا و بۆچوونی کەسانی دی خۆیان لە باوەشی هەندێك سەودا هاویشتووە، بەڵام لە ئەنجامدا هەم لەلایەن ئەو مارانەوە گەزراون کە بێداریان کردوونەتەوە و هەم سەرراونەتەوە. خۆزگە ئەم سەرانەوەیەش تەنها خۆیانی بگرتایەتەوە!

# حەق

ئەو کەسەی حەقی لایە خۆشویستراو و قبووڵکراوە، ئەگەر دوژراویش بێت، بەڵام ناحەق ناشرین و بێزلێکراوە، ئەگەر براوەش بێت...

***

حەق لە خۆیدا جوانە و خاوەنی حەقیش شیرینە. خاوەنی حەق ئەگەر لە تەویش بنیشێت هێشتا پاك و بێگەردە، بەڵام ناحەق ئەگەر بە میسکیش بشۆردرێت هێشتا ناپاك و بۆگەنە...

***

گەر ڕەنگ و شێوەش بگۆڕێن ناوەڕۆک ناگۆڕێت.. ناو و نیشانیش بگۆڕێن زات ناگۆڕێت. ئەو شتەش کە زۆربەی جار مرۆڤەکانی خەڵەتاندووە گۆڕانی ڕەنگ و شێوە و ناو و نیشان بووە.

***

ئەو کەسەی ستەم لە لاوازان بکات، ئەگەر براوەش بێت هەر دۆڕاوە، خاوەنی حەق ئەگەر دۆڕاویش بێت هەر براوەیە.

## حەق و دادپەروەری

دادپەروەری لە بەهێزترین سیستەمە میکانیکییەکانیش بەهێزترە.

***

ئەگەر حەق شمشێرێکیش بێت بەژوور سەرتەوە، سڵ لە درێژکردنی ملت مەکەرەوا

***

حەق، کاتێک کەسانێکی دەستدەکەوێت کە لێی تێدەگەن و بۆ کەسانی تری ڕوونیدەکەنەوە و نوێنەرایەتی دەکەن و خۆشیان دەوێت، باڵدەگرێت.

***

دادپەروەری سەرمایەیەکە لە هەموو شوێنێک دەخوات.

***

دادپەروەری، یەکێکە لە ڕێگەکانی نزیکبوونەوە لە خوا، بەڵام ئەو شتەی مایەی سەرسامییە ئەوەیە کە زۆربەی خەڵکی خۆیانی لێ بەدووردەگرن.

***

شووراکانی ئیسلام حەق و، دەرگاکەی دادپەروەری و ناوەوەشی بەختەوەرییە.

***

ئەو کەلاوانەی کە تیایاندا دادپەروەری باڵادەستە لە کۆشکەکان بەنرخترن و. ئەو سەرایانەش کە لە هاتوهاواری ستەمدا خنکاون لە وێرانەکان پەرتشاترن.

***

بەهێزبوونی یەقین سەبارەت بە جیهانەکانی ئەودیو، بە مانای بەهێزبوون و پتەوبوونی بیری حەق و دادپەروەریش دێت.

***

ئەو کەسەی ململانێ لەگەڵ حەقدا بکات، زوو یان درەنگ دەشکێت.

***

کاتێك خەڵکی پێشێلدەکەیت، هەرگیز لەبیرت نەچێت کە هێزێکیش هەبە بتوانێت پێشێلت بکات!

## خێر و شەڕ

ئەنجامدانی خێر لە ڕوانگەی دینەوە ئەرك و، لە سۆنگەی ویژدانیشەوە ڕەفتارێکە شایانی ستایشکردنە. ئەنجامنەدانی خێر لە دیدی دینەوە گوناه

و، لە ڕوانگەی حیکمەتەوە کەمیی ئەخلاق و، لە گزشەی ویژدانیشەوە پێچەوایی و هەرزەییە. لەوانەیە هەندێك جار خێر بێسورد و تەنانەت تا ئەندازەیەکیش زیانبەخش بێت، بەلام هەرگیز نابێت بە شەڕ. بەلام شەڕ بەتەواوەتی پێچەوانەی ئەمەیە...

## سیستەمی کۆماری

کۆمار، بە مانای ئیدارەیەك دێت کە تێیدا خەلك مافی هەلبژاردن و ڕاوێژیان هەیە و، یەکەم کتێبیش کە بەشێوەیەکی تەواو و دوور لە گشت کەموکورتییەك ڕوونی کردبێتەوە قورئانی پیرۆزە. نیشاندانی سیستەمی کۆماری وەك شتێکی پێچەوانەی قورئان، ئەگەر بەئەنقەستیش نەبێت، شەرمەزاری نەزانییەکی خەسوخۆلە، لایەنگرتنی سیستەمی کۆماری و چاونوقاندن لەئاست سەرچاوەکەشیدا جگە لە عینادی و کەللەڕەقی چیدی نییە.

***

پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَالسَّلَامُ)، هەروەك ئیدیعای پاشایەتی نەکردووە، خەلیفە ناوازە و نایابەکانیشی نەیانهێشتووە ناویان وەك مەلیك و سولتان دەربچێت. پاشایەتی، بە دوورکەوتنەوە لە ڕۆحی ئیسلام هاتە گۆڕێ و، بەئەندازەی دوورکەوتنەوەکەش بوو بە هۆکاری ستەم و خۆسەپاندن.

***

سیستەمی کۆماری کە پالی بە بیری ئازادیی ڕاستەقینە و

دادپەروەرییەوە داوە، لەپاڵ ئەوەدا کە شێوازێکی ئیداریی بەرز و سەلامەت، سیستەمێکی هەتابڵێیت ناسکە. بەتایبەت ئەگەر لەم ڕووەوە چاودێری و پارێزگاری لێنەکرێت، بەئاسانی ئیلحاد و ئانارشی لە هەناویدا چەکەرە دەکات.

* * *

سیستەمی کۆماری شێوازی ئیدارەی ڕۆحە بەرزەکانە و گونجاوترینیشیانە لەگەڵ شەرەف و کەرامەتی مرۆڤدا. بەڵام سەبارەت بەو ڕۆحە کاڵوکرچانەی بە کەماڵ نەگەیشتوون یان هەستیان بە ڕێگاکانی کەماڵاتی مرۆیی نەکردووە، سەرابە لە بیابانێدا و، چەرداخێکی پیس و شڕی وەهایە کە بۆ مانەوە و نیشتەجێبوون دەستنادات.

* * *

سیستەمی کۆماری، لە حوکمی دایك یان پەروەردەکاری ئازادیدایە، ئەوەکانی عاشق بە ئازادی. ئەو گۆش و گەورەیان دەکات. گۆشیان دەکات و گەورەیان دەکات بەڵام هەرگیز ئیدارەیەك نییە بۆ "ئازادیی سەرتاسەریی ڕەها"؛ بەڵکو حکومەتی ئەزیلەت و ئازادیی ئەخلاقە.

* * *

کۆمار، لە ڕێگای ئەو بەهایانەوە کە مرۆڤ بەرزدەکەنەوە زەمینە بۆ بەرزبوونەوەی مرۆڤ ئامادەدەکات؛ پاشان لەگەڵ ئەخلاقی بەرز و ویژدانی هۆشیاردا بە تەنها جێی دەهێڵێت. لەمەودوا ئیدی هەموو تاکێك لە ماڵەکەیدا و لە کارەکەیدا وەکو خاوەن ئیرادەیەکی ئازاد هەمیشە بیر لە چاکە و ئەزیلەت دەکاتەوە و، دوای بەها بەرزە مرۆییەکان دەکەوێت.



ڕۆح، هاوڕێ لەگەڵ ئەو ئارەزووی ئازادییەی کە لە هەناویدایە، نایەوێت هیچ هێزێکی بالادەست کۆنتڕۆڵی بکات. لەبەر ئەوە، بە پەرچەکردار رەلامی ئەو سنوورانە دەداتەوە کە بۆ بیرکردنەوە و ڕەفتار و گوفتارەکانی دەکێشرێن. لەم ڕووەوە ئەوانەی لایەنی سیستەمی کۆماری دەگرن، کاتێک لەلایەک ماف و ئازادیی فراوان بە تاکەکان دەبەخشن، پێویستە لەهەمان کاتدا بەرەو ئەخلاق و فەزیلەت و بیرکردنەوە و ئیرادەش بەرزیان بکەنەوە.



پاراستنی هەستی ئایینی و بیری دینی لە پێداویستی و داخوازییەکانی سیستەمی کۆمارین. لەم ڕووەوە، سووکایەتیکردن بە خەڵکی لەسەر هەست و بیری دینییان و، دەستدرێژیکردن بۆ سەر مافەکانیان و تاوانبارکردن و ئازارداننیان لە سیستەمێکی کۆماریدا، لەڕاستیدا سووکایەتی و دەستدرێژییە بۆ سەر سیستەمەکە خۆی.



کۆمار، پێویستی بە کەسانێکە کە بەتەواوەتی لێی تێبگەن. پێویستە کۆڕ و پەرلەمانەکانی ئەو بەئەندازەی کۆڕی بیرمەند و حەکیمەکان بەویقار و، بڕیارەکانیش بەوێنەی دادگا هەرە هەستیارەکان دادپەروەر و حەقپەرست بێت.

# سیاسەت

سیاسەت هونەری ئیدارەدان و بەڕێوەبردنە بەئاراستەی ڕازیکردنی خەڵک و خوا. حکومەتەکان، بەئەندازەی پاراستنی خەڵکی خۆیان لە شەڕ و زیانەکان لە ڕێگەی هێز و دەسەڵاتەکەیانەوە و، پاراستنیان لە ستەم بەهۆی دادپەروەرییەکەیانەوە، لە سیاسەتدا بە سەرکەوتوو دادەنرێن و بەڵێنی داهاتوویەکی گەش دەدەن. ئەگینا ڕۆشناییان دەکوژێتەوە و دەڕووخێن و، لە دوایانەوە کاولبوویەک جێدەهێڵن کە تێیدا جوێن و لەعنەتیان بۆ دەنێردرێت.



سەبارەت بە ئیداری و سیاسییەک ئەم تایبەتمەندییانە زۆر گرنگن: ڕێزگرتن لە حەق، سەروەریی یاسا، شعووری ئەرک، هەستکردن بە لێپرسراوێتی لە کارە سەخت و گرانەکاندا. بەهرە و شارەزایی لە کارە ورد و ناسکەکاندا.



حکومەت واتە دادپەروەری و ئاسایش. لە جێگایەکدا ئەم شتانە نەبن باس لە بوونی حکومەتیش ناکرێت. ئەگەر حکومەت بە ئاشێک بچوێنین، ئەو ئاردەی دەریدەکات ئاشتی و ئارامییە. ئاشێک ئەم بەرهەمانەی نەبێت، تەنها تەقەتەقە و هەرا دەهاڕێت.



ئەوەی کە میللەت بە حکومەتی دەسەڵاتدار بڵێت "حکومەتەکەم" لەوە گرنگترە حکومەت بە میللەت بڵێت "میللەتەکەم". بەڕای من ئەو

تایبەتمەندییەی کە هەمیشە خەڵکان بەدوایدا دەگەڕێن هەر نەمەیە. بەپێچەوانەوە ئەگەر میللەت حکومەتەکەی بە زۆرویەك ببینێت کە دەستی لە گەرووی گیرکردووە، مانای وایە ئەو سەر و ئەو لاشەیە لەمێژە لەیەکتر دابڕاون.

***

پێویستە لە ڕێگەی ڕەفتار و هەڵسوکەوتی دەسەلاتداران و دڵسۆزیان لە کار و خزمەت و فەرمانبەرییەکاندا هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی ڕێزی خەڵك بەرامبەر بە دەوڵەت و حکومەت بدرێت، نەك لە ڕێگەی زەبروزەنگی فەرمانبەرەکانیەوە. هەتا ئێستا کەس لە ڕێگەی خۆسەپاندنی فەرمانبەرە ستەمکارەکان و فریودانی جەماوەری خەڵکەوە پایەدار و سەربەرز نەبووە.

***

ئەو فەرمانبەرانەی کە ئیدارەی دەوڵەتێکی چاك و خاوەن فەزیلەت دەکەن، ئەگەر لە ڕێگەی ڕەسەنایەتیی فیکر و هەست و ناوەرۆکیانەوە هەڵبژێررێن، ئەو دەوڵەتە باش و بەهێزە. حکومەتێکیش کە دووچاری بەدبەختی بووبێت و، کەسانێکی بێبەش لەم تایبەتمەندییانە بکات بە فەرمانبەری خۆی و کاریان پێبکات، حکومەتێکی باش نییە و هەرگیز تەمەندرێژ نابێت. چونکە ڕەفتاری خراپی فەرمانبەرە نابەرپرسەکان زوو یان درەنگ وەك پەڵەیەکی ڕەش لە نێوچاوانی ئەویش دەنیشێت و، لەبەر چاوی ویژدانی گشتیدا ڕەش و تاریکی دەکات.

***

پێویستە فەرمانبەران لە ڕەفتارەکانیاندا ڕەچاوی چوارچێوەی یاساکان

بکەن بەڵام بەئەندازەی نەرمیی ویژدانیشیان نەرمونیان بن. بەم شێوەیە هەم دەتوانن نابڕووی خۆیان و، هەم هی یاساکان و، هەم هی دەوڵەتیش پارێزن. نابێت ئەوە لەیادبکرێت کە زبری و ڕەقیی لەئەندازەبەدەر تەقینەوەی چاوەڕواننەکراو دەهێنێتە بەرهەم و، نەرمیی لەئەندازەبەدەریش دەبێت بە هۆکاری ئەوەی کۆمەڵگا ببێت بە شەتڵگەی بیر و بۆچوونە چەوت و زۆڵەکان.

***

یاساکان، لە هەموو شوێنێك و هەموو کاتێکدا بۆ هەموان یەکسانن؛ پیادەکەرانیشی پێویستە هەم ئازا بن و هەم دادپەروەر، بۆ ئەوەی کاتێك جەماوەری خەڵکی لێیان دەترسن و، بەتەواوەتی هەستی ئارامی و سەلامەتی لەدەستنەدەن.

***

ئەگەر دەوڵەتێك لەلایەن کەسانی بڕوادار و زیرەك و بەهێز و دینامیکەوە نوێنەرایەتی بکرێت، بەهێز و دامەزراو و لە ئەنجامیش دا بە بەختەوەر دادەنرێت.

***

باخەوان ئەمامەکانی گۆشدەکات و بەخێویان دەکات، لە ئەخۆشی و ئافەتەکان دەیانپارێزێت، پاشان لە کاتی خۆیدا میوەکانیان کۆدەکاتەوە. پەیوەندی نێوان حکومەت و میللەتیش پێویستە بەم جۆرە بێت.

***

حکومەتە شکۆدارەکان لە میللەتە شکۆدارەکانەوە لەدایکدەبن، میللەتە

ئکۆدارەکانیش لە نموەگەلیکی وەهاوە دروستدەبن کە تاکەکانی خاوەنی رۆحی زیندوون و، گرنگی بە زانست دەدەن و، هەلومەرجی نابووریان لەبارە و، بیرکردنەوە و تیگەیشتنیان فراوانە و، شەری "مانەوە وەك خود" دەکەن.



ئەو میللەتانەی هیشتا هەموو تاکەکانی بە کەمال نەگەیشتوون، پێویستە لەناو خۆیاندا بەدوای زاناترین و شارەزاترین و بەهرەمەندترینەکاندا بگەڕێن و ئیدارەی میللەتیان بدرێتە دەست. سەبارەت بە میللەت، لە تەسلیمکردنی دەسەلات بە کەسانێك کە لە زانست و عیرفان و بەهرە بێبەشن، تەسووری بەلایەکی تری هاوشێوە ناکرێت.



ئەوانەی کە لە عیرفان و ڕەسەنێتی بێبەشن و لە کاروباری دەولەت تێناگەن، ئەگەر بەهەلە خرابنە سەر ئەرك و کارێك، کەمتەرخەمی ناکەن لەوەی هێزی حکومەت بۆ خۆیان بەکاربهێنن و، بەخراپی کەلکی لێوەربگرن و، لە هەموو جێیەکدا بەدوای بەرژەوەندییەکانی خۆیان بگەڕێن و بەوینەی پادشایەکی خۆسەپێن بەردەوامی بە حوکمی خۆیان بدەن. لە ولاتێکدا کە کەسانی لەم جۆرە کاربەدەست بن، جگە لە نەڕەی ستەمکاران و نالەی ستەملێکراوان چیتر نابیسترێت و، لە شوێنێکیشدا کە ئەم جۆرە دەنگ و سەدایانە ببیسترێن، چارەنووسی عاد و سەموود دەرئەنجامێکی حەتمی دەبێت.



حکومەت پێویستە هەولبدات بیرکردنەوە و تێگەیشتنی میللەتەکەشی ڕێکبخات، نەك تەنها کار و جوولە و هەلسوکەوتەکانی. گرنگترین بناغەی

ئەم ڕێکخستنەش بریتییە لە یەکێتیی بیر و، یەکێتیی هەست و، یەکێتیی پەروەردە و فێرکردن. ئەگەر ئەو تاکانەی میللەتێك پێکدەهێنن، بە کلتووری جیاواز و بیری جیاواز گۆشکرابن و، دژایەتی یەکتر بکەن و، لەسەر بیروڕای جیاواز ململانێ لەگەڵ یەکتریدا بکەن، ڕۆژێك لە ڕۆژان بەحەتمی یەکتریش دەخۆن.

***

یەکێتیی بیر و کلتوور سەبارەت بە بەهێزیی میللەت چەند گرنگە، تێکچوونی یەکێتیی دینی و یەکێتیی ئەخلاقیش لە داڕووخان و پارچەپارچەبوونیدا بەهەمان ئەندازە گرنگە.

***

هەموو شتێك سیاسەتی تایبەت بەخۆی هەیە؛ سیاسەتی ئەوانەش کە زیندووبوونەوەی میللەت ئامادەدەکەن بریتییە لەوەی بیر لە هیچ شتێك و تەنانەت چێژە شەخسییەکانی خۆشیان نەکەنەوە و، تەنها و تەنها خۆشی و چێژەکانی میللەت گوڕوتینیان پێبدات و، بە ئازارەکانیشیەوە بتلێنەوە و بناڵێنن.

***

پێویستە لەناو کەسانێکدا کە مێشکیان لە ئەنجامی بیرکردنەوەی بەردەوامدا زانەکات و کۆیلەی حەقیقەتن، بەدوای ئیدارەی باش و سیاسەتی چاکدا بگەڕێین، نەك لە سەر و ڕیشی سپی و، پاشقول و فریودانی هەندێك لۆبی و، کۆمەڵێك پلەوپایەی وەها کە ڕیاکاری و ماستاوچێتی بە مرۆڤی دەبەخشن.

***

ئەگەر هەموو ماڵێك سەبارەت بە دانیشتووانەکەی خوێندنگایەك بێت بۆ

پەروەردە و فێرکردنیان؛ هەموو خوێندنگایەك سەربازگەیەکی بچووکی وەها بێت کە گەشە بە ڕۆحی سەربازی بدات، هەموو سەربازگەیەك پەرلەمانێك بێت بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی بوون و مانەوە و ئاسایشی میللەت، هەموو پەرلەمانێکیش لە ڕوانگەی ئەرك و دەسەڵاتەکانیەوە وەکو تاقیگەیەکی کۆمەڵایەتی کاربکات و، هەموو ئەو بابەتانەی دێنە بەردەستی بە ئاوێزەی ڕۆحی میللی و بیری میللیدا تێپەڕیان بکات و هەڵیان بسەنگێنێت. مانای وایە ئەو میللەتە خاوەنی نموونەییترین کادیرانی ئیداری و سیاسییە.

***

بیرکردنەوەی جیاواز و موتالای جیاواز کاری مرۆڤە کامڵەکانە. بەڵام ئەوەندەش هەیە کەس مافی ئەوەی نییە لێبووردە بێت بەرامبەر بەو تێگەیشتن و بۆچوونە جیاوازانەی کە کۆمەڵگا بۆ چین و توێژی جیاواز پارچەپارچە دەکەن. چونکە ڕێگەدان بە دابەشبوون و پارچەپارچەبوون، چارنووسانێکە لەناست لەناوچوونی میللەتدا.

***

بەرامبەر بە کەسانێك کە هەمان بیر و هەستی میللییان نییە چەند گەشبین و گومانباشیش بن، نابێت ئەوە بەدووربگرن کە دەگونجێت زیانتان پێبگەیەنن، وە هەرگیز نابێت ڕێگە بدرێت دەست بەسەر ئەو خاڵە گرنگانەدا بگرن کە لە حوکمی دەماری ژیانی میللەتدان! چونکە مرۆڤ دەتوانێت سەبارەت بە مافە شەخسییەکانی خۆی دووچاری مەترسی بکات و لێبوردەیی بنوێنێت. بەڵام هەرگیز مافی ئەوەی نییە میللەت و دەوڵەت دووچاری هەمان مەترسی بکات.

***

پێویستە ئەوە لەبەرچاوبگرن دەگونجێت کەسانێکی وا هەبن کە وەك ئێوە بیرناکەنەوە و خاوەنی هەمان جیهانبینیی ئێوە نین، بەڵام لەگەڵتان تێکەڵاو و صەمیمین و بەسوودن بۆتان، کەواتە نابێت بەپەلە ڕووبەڕووی ئەو بیر و بۆچوونانەن ببنەوە کە وەك هی ئێوەی نین و، نابێت خاوەنەکانیان بتۆرێنن. تەنانەت بە گەڕان بەدوای ڕێگاکانی سوودوەرگرتن لە موتاڵا و فیکریان هەمیشە دەرگای دیالۆگ بەکراوەیی جێبهێڵرێت. ئەگینا ئەم زویربوونەی کە تەنها لەبەرئەوەی وەك ئێمە بیرناکەنەوە و دوورکەوتوونەتەوە یاخود دوور خراونەتەوە، کۆمەڵی گەورە گەورە پێکدەهێنن و ڕووبەڕووتان دەبنەوە و تەختی زەویتان دەکەن. زویربووەکان لە مێژوودا بەئەستەم کاری باش و ئەرێنییان ئەنجامداوە، بەڵام ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی ڕووخاندوویانە ئێجگار زۆرن.

* * *

مرۆڤ پێویستە بزانێت چۆن سوود لەو زانیاری و تێبینییانە وەربگرێت کە پەیوەندییان بە سیستەمی خۆی و بیری خۆی و دونیای خۆیەوە هەیە، ئیدی خاوەنەکەی هەرکەسێك بێت. بەتایبەت هەرگیز سوود وەرگرتن لە خاوەن ئەزموونەکان فەرامۆشنەکات.

* * *

دین، لەو ڕوانگەیەوە کە خاوەنی خەسڵەتی کۆکەرەوەی خەڵکانە، دامەزراوەیەکی گرنگی وەهایە کە پێویستە هەمیشە لەبەرچاوی ئەوانەدا بێت کە میللەت بەڕێوەدەبەن و، پێویستە هەردەم پەنا بۆ هێزە ئەدۆزراوەکەی ببرێت.

* * *

لە دابینکردنی سەلامەتی و ئاسایشی دەولەت و میللەتدا ناتوانرێت هێزێکی دیکەی دووهەم بەئەندازەی هێزی ئایین نیشانبدرێت. چونکە هەروەك دین لە ویژدانەکاندا کاریگەرترین هێزە، بەهەمان جۆر لە ڕێکخستن و کۆنترۆلکردنی جوولە و هەلسوکەوتەکانی تاکیشدا بالادەسترین لایەنە. لەم ڕووەوە پێویستە کاربەدەستان ژیانی ئایینی کۆمەلگا بە ژیانی میللەت بزانن و هەولبدەن لە ویژدانی گشتیدا بەزیندوویی بیهێلنەوە.

***

بەرزکردنەوەی میللەت وابەستەی پەروەردەکردنی لاوەکانمانە لە چوارچێوەی بیر و باوەڕی خۆماندا. بەلام لەهەمان کاتدا لەو ڕۆژگارە تێبگەن کە تێیدا دەژین و، ڕووبەڕووبوونەوەی هۆشیارانە لەدژی هەژاری و نەداری و پاراستنی هەستی بڕوا و متمانەی خەلکی و، بەڕێوەبردنی پیشەسازی و بازرگانی لە خولگەی زانست و بەرهەمە.

***

سێ ماکی گرنگ هەن کە میللەتان دەپارێزن: دین و حیکمەت و چەك. دەتوانین بەم جۆرە تەئویلی حیکمەت بکەین: پەیبردن بە زانستی حەقیقەت و ئاوێتەبوونی لەگەل ژیاندا.

***

دونیا خانەی تاقیکردنەوە و ئەزموونە و، تێیدا هەموو شتێك بەهۆی ئەو مانا و بەهایەوە کە ئەزموونەکان پێی دەبەخشن، پێگەیەك دەگرێت. بەڕای من پێویستە لەلایەك گرنگی بەو شتانە بدرێت کە بە ئەزمووندا تێپەڕیون و، لەلایەکی دیکەشەوە لە ئەزموون و هەلسەنگاندنی نوێدا

کەمتەرخەمی نەکرێت، هەتا لەیەک کاتدا هەم باپیران و هەم نەوەکانی زانست بپارێزرێن.

***

لە پارێزگارەکاندا میهرەبانی و هەستیاری و لێپرسراوێتی و، لە سەرۆک شارەوانییەکاندا ڕێکوپێکی و پاکوخاوێنی و سەلامەتی کووچە و بازاڕ و، لە داوەرەکانیشدا بیری حەقپارێزی و بێلایەنی و بوێری، بناغەن.

***

ئەگەر میللەتان و دەوڵەتان حەز بە چارەی یەکتر نەکەن، تا ڕادەیەک شتێکی سروشتییە. لەم ڕووەوە سیاسەتی نێوانیان یان لە خولگەی دۆستایەتییەکی گەرموگوڕ و یان لە تەوەرەی بەرژەوەندیدا دەخولێتەوە. هەردووکیان ئاساییین، بە مەرجێك لایەنەکان نە زیان ببەخشن و نە زیان وەربگرن. بەڵام ئەگەر ئێمە کەسیش نەخەڵەتێنین پێویستە هەمیشە بۆ ئەوەی نەخەڵەتێنرێین بێدار و چاوکراوە بین؛ ئەمەش یەکێکی دیکەیە لە لایەنەکانی سیاسەت.

***

ئەوانەی وا دەزانن سیاسەت تەنها بریتییە لە حیزب و پڕوپاگەندە و هەڵبژاردن و دەسەڵات هەڵە دەکەن. بەڵکو سیاسەت بریتییە لە تێڕامان لەمڕۆ لەگەڵ بەیانیدا و بەیانیش لەگەڵ دوو بەیانیدا و، هونەرێکی بەڕێوەبردنی خاوەن ئاسۆی فراوانی وەهایە کە تێیدا ڕەزامەندیی خوا و خەڵك پێکەوە سوتالاّ دەکرێن.

***

ڕابردوو، قوتابخانەیەکی پڕ لە تابلۆی پەند و عیبرەت و نموونەی

رەهایە کە لە ژیانەوە وەرگیراون. ئەوانەی زۆر باشی قازانج و سوودەکانی ئەم قوتابخانەیە دەناسن و هەڵیدەسەنگێنن، دەتوانن سەرکەوتووانە حوکمی داهاتووش بکەن. چونکە ئەمڕۆ دوێنێ دەچێت و، دوێنێش لە ڕۆژی پێش خۆی.. ئەو شتەی دەگۆڕێت تەنها ڕەنگەکانە.

***

دەسەڵاتی هێز کاتی و ڕاگوزەرە؛ ئەو شتەی دەمێنێتەوە دەسەڵاتدارێتیی حەق و دادپەروەرییە. ئەم شتانە ئەگەر ئەمڕۆش نەبێت، بێگومان لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا سەردەکەون. لەبەر ئەوە پێویستە خەڵکی لە حەق و عەدالەتدا بەدوای گەورەترین سیاسەتدا بگەڕێن.

***

بەشێکی زۆری خەڵکی ئەم ڕۆژگارە سیاسەت بە یاری و فێڵ و تەڵەکە سیاسییەکانی ڕۆژانە و، خەڵەتاندن و فریودانی جەماوەری خەڵك و، ململانێکانی بەرژەوەندی و دەسەڵات و، نیشاندانی سەرجەم نامەشروعەکان لەم پێناوەدا وەك شتانی مەشروع و ڕێپێدراو، دەبینن. هەربۆیە لەپێناو ژیانی دڵ و، ڕاسترەویی بیر و، پەیوەندییان لەگەڵ خوای گەورەدا، دوورکەوتنەوە لە هەموو جووڵانەوەیەکی سیاسی بە شتێکی پێویست دەبینن. هەیهات! ئەو سیاسەتە لە کوێ کە لەگەڵ حەق و دادپەروەری یەکی گرتووە و، ئەو مەهزەلەی کۆلانەکان لە کوێ کە زۆربەی درۆ و تەزویرە!

# مزگەوت و فەرمانەکانی

مزگەوتەکان ئەو جێگایانانەن کە تەنانەت لە سەختترین و ناخۆشترین ڕۆژەکانیشدا تیایاندا بابەتەکانی پەیوەندیدار بە ئیمان و قورئان موتاڵا دەکرێن.

***

مزگەوتەکان، بەوێنەی قوتابخانەیەك کە هەموو ئاستەکانی لەخۆگرتووە، خانەی عیلم و عیرفانن.

***

مزگەوتەکان کۆمەڵێك پێگەی ئاسمانی وەهان کە تیایاندا لەپاڵ پەرستشدا زیکر و فیکریش بە زیندووترین شێوە ئەنجامدەدرێن.

***

مزگەوتەکان، لە سەردەمێکی دیاریکراودا، کۆڕی ڕاوێژی پیاوانی دەوڵەت بوون.

***

ئەنجامدانی تەنانەت کارە دونیاییەکانیش لە جێگایەکی وەك پەرستگادا کە بە ڕووی جیهانی لاهوتدا کراوەیە، لەو ڕووەوە کە چەندین قازانج پێشکەش بە ڕۆحەکان دەکەن، لەسەرروو وەسفکردنەوەن.

***

مزگەوتەکان لەو لایەنەوە کە ژیانی ئیمانداران ڕێکدەخەن وەکو فێرگەیەکی ئاسمانی وەهان.

# بازرگانی

بازرگانی، بریتییە لە داواکردنی ڕۆزی لەو خوایەی کە جلەوی هەموو شتێکی بەدەستە لەڕێگەی زمانی پارە و شمەکەوە. ئەم کردار و داواکردنە پێویستە بەحەتمی ئەنجامبدرێت، بەڵام نابێت ئەوەش لەیادبکرێت کە هاتنەدی داواکارییەکان تایبەتن بە ئەوەوە.

***

زانست و تەکنەلۆجیا چەندەش پێشبکەون، ڕۆڵی بازرگانی و کاریگەرییەکانی لە ئایندەدا، لە ئێستاش گەورەتر و گرنگتر دەمێنێت. تەنانەت حکومەت و دەسەڵاتەکان لەسایەی ئەودا دەردەپەڕنە مەیدان و بەیارمەتیی ئەو بەردەوامی بە بوونیان دەدەن.

***

بەوێنەی هەموو شتێکی دی، لە بازرگانی و سنعەتیشدا ڕۆڵی زانست و پسپۆڕی زۆر گرنگن. بەڵام نابێت ئەوەش پشتگوێبخرێت کە ئەم دوو پیشەیە لەسەر بنەمای شاگردیتی دامەزراون.

چەندەها بابەتی ناو کتێبەکان هەن هەتا بە ئاوێزەی بەهرە و کارامەیی وەستایەکدا تێنەپەڕن کە شاگردی و خەلفەیەتیشی بینیوە، ئەستەمە ئەنجامی بەسوود و چاوەڕوانکراو بخەنەوە.

* * *

سەبارەت بە بازرگانێك كە لە چوارچێوەی حەرام و حەلاڵدا كڕین و فرۆشتن دەكات، هەموو ئەو خولەكانەی كە لە كار و پیشەكەیدا بەسەری دەبات بە پەرستش حسابن.

* * *

لەبەرئەوەی زۆربەی جار پاكوخاوێنی و ڕێكوپێكی یان پیسی و شپرزەیی شوێنی كار و بازرگانی، ڕەنگدانەوەی حاڵەتی ڕۆحیی فرۆشیار و بازرگانن، نابێت ئەو ڕاستییە فەرامۆشبكرێت كە ئەم حاڵەتە كاریگەری ئەرێنی یان نەرێنی لەسەر مشتەری و كڕیار دەبێت.

* * *

بازرگان و فرۆشیاری فێڵباز و تەڵەكەچی بەم كارمیان سەرەتا دژایەتی پەروەردگار و ریژدانی خۆیان دەكەن، پاشان بە ئاشكرابوونی فێڵەكانیان لەناو خەڵكیشدا، متمانە لەدەستدەدەن و، لەو جێیەدا دەدۆڕێن كە دەبوو قازانج بكەن.

* * *

ڕۆحی بازرگانی بریتییە لە ڕاستی و دروستی و ئەمانەت و تێگەیشتن لە ڕۆژگار و ڕەفتاری جوان و ناسك بەرامبەر بە كڕیار و مشتەری، ئەو كەسەی لە یەكێك لەمانەدا كەمتەرخەمی هەبێت ڕۆحی بازرگانی زامداركردووە و، لە ئەنجامیشدا ڕێگاكانی قازانجكردنی خۆیان بەدەستی خۆیان دەگرن.

* * *

بازرگانان و سنعەتكاران پێویستە ڕووخۆش و زمانشیرین و خاكی و

ڕاستگۆ و دامەزراو و هەوڵدەر و کۆڵنەدەر بن. ئەم تایبەتمەندییانەی کە بۆ هەموو خاوەن پیشەکان دارای گرنگین، سەبارەت بەم دوو پیشەیە گرنگترن، چونکە بازرگانان و سنعەتکاران هەم لەگەڵ خەڵکدا زۆر تێکەڵاون و هەم ئەم خەسڵەتانە پەیوەندییەکی بەتینی بە قازانج و زیانی کارەکانیانەوە هەیە.



ئەوانەی ڕۆژانە کاتژمێرێك پێش لە خەڵکی شوێنی کاریان دەکەنەوە و کاتژمێرێك دوای کاتی ئاسایی دایدەخەن، مانگیان دەبێت بە سی و پێنج ڕۆژ و ساڵیشیان بە چوار سەد. بێگومان بەو مەرجەی لە شوێنی کارەکانیاندا وەزیفەی سەرەکی بەندایەتی تا چەند دەستدەدات فەرامۆشنەکەن...

## دەربارەی زمان

زمان، یەکێکە لە گەورەترینی ئەو دیارییانەی کە خوای خاوەن ڕەحمەتی بێسنوور پێشکەشی مرۆڤەکانی کردووە. مرۆڤ بەهۆی ئەوەوە مرۆڤێتیی خۆی دێنێتە سەر زمان و، بەرەو زانستەکان باڵدەگرێت و، لەگەڵ ئەوەکانی داهاتوودا دەژی... نازانم داخۆ ئەوانەی تێکی دەدەن و دەیشێوێنن، ئاگاداری گەورەیی ئەو خیانەتە هەن کە ئەنجامیان داوە؟!

# بیری ماکیاڤێلیستی[1]

جاران وا دەزانرا ڕێگای خۆناساندن لە ڕێگەی ناشرینکردن و تاوانبارکردنی کەسانی ترەوە تەنها تایبەت بێت بە گروپێك دووڕووی ڕۆژهەڵاتەوە. بەداخەوە ئێستا هێندە پەرەی سەندووە کە بەشێکی زۆری ئەوانەش کە بە ناوی حەقەوە کاردەکەن و لەپێناویدا هەوڵدەدەن کار و چالاکییەکانیان لەسەر ماکیاڤێلیزم بنیاتدەنێن. بەدبەختی بۆ ئەوانەی لە ڕێگەی نامەشروع ناحەقەوە بەدوای حەقدا دەگەڕێن! بەدبەختی بۆ هەموو ماکیاڤێلیستەکان!

# سەرکەوتنی چاکی و جوانی

هەوێنی سەرەکیی دونیا چاکی و جوانی و ڕاستی و فەزیلەتە. دونیا زوو یان درەنگ دێتەوە سەر ئەم هێڵ و خولگەیە و کەسیش هێزی ڕاگرتنی ئەمەی نییە.

---

١. ماکیاڤێلیزم: بریتییە لە تیۆرێکی فەلسەفی و سیاسی کە لەسەر بیر و بۆچوونەکانی نیکۆلۆ ماکیاڤێلی، نووسەر و سیاسەتوانی ئیتالی دامەزراوە. ماکیاڤێلی لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا بە ناوی "میر". ڕای وایە بۆ گەیشتن بە ئامانج هەموو جۆرە ڕەفتار و هۆکارێك ڕێگەپێدراوە و، پێویستە دەسەڵاتدار خۆی لە هەستەکانی دابڕێنێت و بەرژەوەندی بخاتە لاوە.

# مەردی خزمەت

مرۆڤی خزمەت لەپێناوی ئەو بەهایانەی دڵی پێوە پەیوەستکردووە ئامادەیە زۆر چاونەترسانە بەسەر دڕك و داڵ و سەختی و ناڕەحەتیدا بگوزەرێت و بڕوات، مرۆڤی خزمەت بەرامبەر پەروەردگاری مەزن هێندە پێگەیشتوو و بەئەدەب و ڕەوشتبەرزیشە کە هەرکاتێك ئامانجەکەی دەپێکێت و سەردەکەوێت، خۆی ناکاتە خاوەنی سەرکەوتنەکان بەڵکو هەمووی دەداتە پاڵ خاوەنە ڕاستەقینەکەیان، هەر دەنگ و سەدایەك بە ناوی خزمەتەوە بەرزببێتەوە بە زیکر و تەسبیحی دەزانێت، بە چاوی ڕێزەوە لە هەمووان دەڕوانێت. هێندە بڕوای بە توانا و قودرەتی خوای گەورە هەیە کە لە کاتی چەپڵەلێدان بۆ سەرکەوتنی تاکەکانیشدا سەرکەوتنەکان هەر دەداتە پاڵ پەروەردگاری و خۆی دەپارێزێت لەوەی تاکەکان بکاتە بت لە هزری خۆیدا.

مرۆڤی خزمەت هەرکاتێك لەهەر شوێنێك پێویست بێت کارێك ئەنجامبدرێت، ئەو یەکەم کەس دەبێت کە خۆی بە بەرپرسیار دەزانێت بەرامبەری. لەبەرامبەر هەموو ئەوانەی کە خەمی هەڵگرتنی مەشخەڵی حەقیان هەیە تا بەرزترین ئاست بەڕێز و بەویژدانە. مرۆڤی ئەم ڕێیە گەر تووشی شکستیش بێت و، دامەزراوە و پلانەکانیشی تێکبشکێنرێت و یەکبوون و یەکێتیی پەرت بکرێت و هێزی ئەوی بکرێت، هێشتا بەوپەڕی بڕوا و ئومێدەوە مامەڵە دەکات و پاشانیش کە دووبارە ڕوو بە ئاسۆ بەرەو سەرکەوتن لە شەقەی باڵ دەداتەوە، هەر چاوپۆشی و لێبوردەیی دەکاتە پیشەی خۆی.

مرۆڤی خزمەت خاوەن بەسیرەت(بینایی دڵ)ە و کەسێکی واقیعبینە و هەر لە سەرەتاوە ئەوەی پەسەندکردووە کە ئەم ڕێگایە یەک پارچە هەوراز و نشێوییە. هەروەها هێندە باوەڕێکی پتەو و هیممەتێکی بەرزی هەیە کە ئەگەر چاڵەکانی دۆزەخیش لەبەردەمیدا ببنە لەمپەر ئامادەی تێپەڕاندنیانە و، وەک ڕێبوارێکی ئەوینداری ئەو ڕێبازەی سەری لەپێناودا داناوە، دەمێت هێندە وەفادار بێت کە تەنانەت لە جان و جانان بگوزەرێت بەبێ ئەوەی جارێکی دیکەش بیانهێنێتەوە بە خەیاڵیدا. بەڵێ ئەو مرۆڤێکی ڕۆح و کەسێکی ڕاستگۆ و لەخۆبوردەی لەم شێوەیەیە.

## پێشکەش بە مەردانی ئیرشاد

پێغەمبەرمان لە ژیانیدا تەنها یەک جار حەجی کردووە. بەڵام هەموو ژیانی لە تەبلیغ و ئیرشاددا بەسەربردووە.

***

ئەوانەی کارەکانیان تەبا و گونجاو نین لەگەڵ ئەو چاکە و بەخششانەدا کە خوا بەخشیونی، کانیاوی خۆیان کوێردەکەنەوە.

***

دەکرێت هەندێک لە ئرمێسکەکان ببن بە هۆکاری فەتحکردنی زۆرێک لە دڵان.

***

گەورەیی لە کاری گەورە و ئەخشەی گەورەدا نییە، بەڵکو لەوەدایە

ئادەمیزاد چاو لە ڕەزامەندیی خوای گەورە ببڕێت و، خوای گەورەش پێی بفەرموێت "من لێت ڕازیم".

***

ئەکەیت وەشاندنی تۆو بخەیتە وەرزی دووریینەوە و خەرمانەوە، ئەگینا هەوڵی هەردوو وەرزەکەت بەخۆڕایی دەڕوات!

***

مەرجە مرۆڤی باوەڕدار لە زەمینەی کرداردا بیروباوەڕی خۆی بچەسپێنێت. کاتێک ئیمان و کردار هەستەکانی کەسێک دەخەنە ژێر فشارەوە، ئیدی لە هەڵسوکەوتەکانیشیدا دامەزراوی و ڕاستڕەوی بەدیاردەکەون.

***

دەستڕۆیشتنی ئێمە لە زەویی خوادا وەک دەستڕۆیشتنی فەمانبەران و کارگوزاران وایە لە زەویی میریدا.

***

ئەگەر کەسێک گوناهەکانی ئازاری بدەن، مانای وایە چاک و خراپ لەیەکتر جیادەکاتەوە.

***

دوژمنی سەرکەوتن خۆشگوزەرانی و پاڵدانەوە. سەرکەوتنی موسڵمانان تەنها ئەو کاتە دێتەدی کە وەک گزماندن سادە و ساکار بژین.

***

ئەگەر هێلکە و جوجەڵەیەکی زۆرت هەن، ئەخەڵەتاییت هەموویان لە یەک سەبەتەدا دابنێیت!

•••

پلان و نەخشەرێژی ئەگەر نەتوانێت قەدەریش بگۆڕێت، لە ئەنجامدا مرۆڤ لە بەرد گرتنە قەدەر دەپارێزێت.

•••

گرمانباشی جیایە لە گرمانباشی و پشت پێنەبەستن... دیاریکردنی شوێنی هەریەك لەمانە کاری ئەریایی قیراسەتە.

•••

ئەو شتەی لە تەبلیغدا گرنگە بریتییە لە ئیخلاص و وەرگیرانی لەلایەن خەڵکەوە. نابێت هیچ کەسێك هەوڵبدات تەبلیغی کەسانێك بکات کە بە ناست لەسەروو خۆیەوەن، دەنا ئەنجامەکەی بەپێچەوانەوە دەبێت. نابێت کوڕ بەرامبەر باوك و، قوتابی بەرامبەر مامۆستا و، شاگرد بەرامبەر بە وەستاکەی قسەیەکی هەبێت. لەم ڕووەوە قبوڵنەکردنی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەری خوا لەلایەن ئەبو تالیبی مامیەوە شایەنی هەڵوێست و تێڕامانە...

•••

دایك و باوك ناکرێن بە قوربانی هیچ شتێکی تر. بەڵام ئەگەر ئەوان وتیان "خزمەت مەکە!" لەم قەدەغەیەدا گوێڕایەڵییان ناکرێت. جگە لەمە، ئەوانەی گوێڕایەڵیی دایك و باوکیان دەکەن پیت و بەرەکەت لە ژیانیاندا دەبینن‌ەوە.

•••

ئیماندار لە سەرزەویدا و نوێنەری ئاشتی و ئاسایشە.

•••

مرۆڤ نابێت لەگەڵ باوکیدا مشتومڕ بکات، با لەسەر هەقیش بێت.

سیفەتی جەلالی لە هەموو کەسێکدا بەشێوەیەکی جوزئی یان کوللی بوونی هەیە. تووڕەبوون سیفەتێکی قبووڵکراو نییە، بەڵام کاتێك بە پەروەردەی موحەممەدی پەروەردە دەکرێت، بەرامبەر بە دوژمن لە شێوەی ویقاردا و، بەرامبەر بە ئیمانداریش لە شێوەی خۆبەکەمزانیدا خۆی دەنوێنێت.

***

ئەگەر لەبەر هەندێك هۆکاری تایبەت پێویست بکات هەندێك کەس ئەو بڵاوکراوانە بخوێننەوە کە دوژمنایەتی ئیسلام دەکەن و هێرشی دەکەنە سەر، هیچ نەبێت پێویستە ناگایانە و هۆشیارانە بخوێنرێنەوە.

***

دەگونجێت هەڵسوکەوتی مرۆڤانە بەرامبەر بە کەسانی خراپەکار و زیانبەخش ڕێگە لە زیانیان بگرێت. پێویستە لەبیرمان نەچێت کە "ئیحسان کۆیلەی ئیحسانە"...

***

ئەوانەی لە زاتی خۆیاندا بچووکن، هەمیشە کەسانی بچووك و خاوەن کەسێتیی نزم لە دەوروبەری خۆیان کۆدەکەنەوە. وادەزانن بەم شێوەیە دەتوانن کەمێك ناستی خۆیان بەرزبکەنەوە.

***

شەیتان زۆرجار ئەو کەسانە لە ڕێ دەردەکات کە ژیانیان لە خولگەی ئیرشاد و بانگەوازدا بەسەرنابەن. ئەوانەی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە ناکەن، لە بەرەکەتی وەحی مەحرووم دەبن. ئەم کەسانە هەرگیز سروەی ئیلهام بەسەریاندا هەڵناکات. لەوانەیە بتوانن کتێب بنووسن، بەڵام

نووسینەکانیان ڕەش و تاریکە و پیت و بەرەکەتی تێدا نییە. وەلێ لەوانەدا
کە سەرقاڵی ئەرمان بە چاکە و ڕێگرین لە خراپە، هەمیشە شنەبای ئیلهام
دەبینرێت. لەبەرئەوە ئێمەوەمانان پێویستە بەردەوام بخوێنینەوە و بیربکەینەوە و
بەردەوام هەوڵبدەین شتێك بە کەسانی تریش بگەیەنین، هەتا بتوانین لەسەر
ئاستی ڕۆح بەزیندوویی بمێنینەوە.



پێویستە ئەمڕی هەموو موورشید و ڕێنموونیکارێك لەم ڕۆژگارەدا تەنها
ڕەزامەندیی خوا بێت و، هیچ بیر و هەستێکی دونیایی نەبنە ئامانجی.
ڕێنموونیکار پێویستە بەم جۆرە بیربکاتەوە "ئەگەر ڕۆژێك ڕێم لە دۆزەخیش
هەڵکەوت، پێویستە بەدوای سیمایەکی ئاشنادا بگەڕێم و لەوێشدا باسی حەق
و حەقیقەتی بۆ بکەم." ئەمەش بۆزترتنی بیرکردنەوەی ئەو بانگەوازکارە
نموونەییەیە کە لەم سەردەمەدا پێویستمان پێیەتی.

## (ئامێنت)ی مرۆڤە مەزنەکان

هەریەك لە بەرزڕاگرتنی مەفکورەی خزمەتەکەمان کە بریتییە لە
خزمەتکردنی مرۆڤایەتی لەپێناو خوادا، بەسەر هەموو ئارەزوویەکی نەفسی و
جەستەیی و، هەڵبژاردنی بەسەر پێداویستی و ئارەزوو مرۆییەکاندا و، ئەوەی
کە دوای ئاسینی حەقیقەت، بەجۆرێك دامەزراو بین کە ئامادەبین سەرجەمی
خۆشەویستان و ئەو شتانەش کە دڵمان پێیانەوە بەستراوە بەخت بکەین و،
ئەوەی کە لەپێناو ئامانجە باڵاکەماندا سنگ دەربپەڕێنین لە ڕووداوە هەرە

سەخت و قورسەکان و، ڕێگاکانی بەختەوەریی بە ڕووی ئەوەی ئێمەدا بکەینەوە و، ئەوەی کە بە خۆڕزگارکردن لە گشت حەزە ماددی و مەعنەوییەکان لە بەختەوەریی کەسانی تردا واتای ژیانمان بدۆزینەوە و، هاوڕێ لەگەڵ فەلسەفەی "لە خزمەتدا لە پێشی پێشەوە و لە پاداشتدا لە دوای دواوە"، خۆمان بەدووربگرین لە کێشمەکێشی دەستخستنی پلەوپایە و ناوبانگ... بەڵێ، ئەمانە ئەو ئامانجانەی بوونی ئێمەن کە بەهیچ شێوەیەک ناتوانین دەستبەرداریان ببین.



ئەوانەی لە بزووتنەوەیەکدا لەپێشەوەن، لە ڕوانگەی پێگەکەیانەوە، هەر خوو و خەسڵەتێکی جوان و باشیان تێدا بێت چەند هێندانە لەوانەی دوای خۆیاندا ڕەنگدەداتەوە. بەهەمان جۆر هەر حاڵەت و ڕەفتارێکی نابەجێی ئەوانیش دەگونجێت ئەوانەی دی لە خود و ناوەڕۆکی خۆیان دووربخاتەوە و، بیانکات بە چەند ڕۆحێکی هەرزە و چاولێکەر.

## گیانفیدایانی خۆشەویستی

دونیای ڕۆشن و بەختەوەری ئایندە تەنها ئەو قارەمانانەی بواری خۆشەویستی بنیاتی دەنێن کە بە عەشق و خۆشەویستن باڵیان گرتووە. ئەو قارەمانانەی خۆشەویستی کە بزەی خۆشەویستی لەسەر لێویانە و، دڵیان خەرمانی خۆشەویستییە و، ڕوانینیان هەستە مرۆییەکانی لێدەتکێت و، نیگای میهرئامێز ئاراستەی هەموو کەس و هەموو شتێک دەکەن و، لەو خۆزانەوە کە

هەڵدێن و ئاوادەبن و، لەو ئەستێرانەوە کە دەگەشێنەوە و دەکوژێنەوە، هەمیشە پەیامی خۆشەویستی وەردەگرن...



تەنانەت تووڕەبوونی ئەو گیانفیدایانەی خۆشەویستی کە پەیوەندی نێوان خۆیان و چواردەورەکەیان لەسەر خۆشەویستی قورمیشکردووە، لەو ڕووەوە کە ئامانج لێی ڕێکخستن و ئامۆژگاری و نیشاندانی ڕێی ڕاستە و، هێنایە بۆ جێبەجێ و ڕیقار، هەمیشە بە بنیاتنەر و سوودبەخش دادەنرێن.

# ئامانج و هۆکار

لە هەموو کار و هەوڵێکدا پێویستە سەرەتا ئامانج و مەبەست دیاری بکرێت، هەتا مرۆڤ بە هۆکارەکانەوە نەبەسترێتەوە. لەو خزمەتانەدا کە لە ڕێگەی میللەتدا ئەنجام دەدرێن، ئەگەر ڕۆح ئاراستە نەکرێت و ئامانجی نیشانەدرێت، بیر و بۆچوونەکان شێوەی گەردار وەردەگرن و، ئەوانەش کە خزمەت دەکەن وەك زەبوون و دیلێکیان لێدێت.



پێویستە لەسەر ئاستی بیرکردنەوە ئامانج و مەبەست هەمیشە یەکەمین و گرنگترین جێگا بگرن. ئەگینا دووچاربوون بە زۆری و پاشان بە سەراسیمە بێت. چەندین هەڵمەتی سەرنجڕاکێشی وەها کە بەهۆی ئاڕوونی ئامانج و هۆکارەکانیەوە بێبەرهەم بوون، ئەمانە هەرووەك بە هیچ ئەنجامێکی خێردار نەگەیشتوون، لەدوای خۆیانەوە چەندین کین و ئەفرەتیشیان بەجێهێشتووە.



پێویستە لە دیدی هەموو کەسێکی خاوەن هەڵمەت و بزاوتندا سەرەتا و پێش لە هەر شتێکی دی بەدیهێنەری مەزن و ڕەزامەندییەکەی بوونی هەبێت. ئەگینا چەندین بت دێنە ئەو ناوەندەوە و، ناحەق خۆی لە شێوەی هەقدا دەردەخات و، هەوا و ئارەزوو پۆشاکی فیکر دەپۆشن و، بە ناوی غەزاوە چەندەها تاوان ئەنجام دەدرێت...



ئەو کارانەی کە لەپێناو ڕەزامەندیی خوای گەورە دەکرێن، گەردیلەیەکیان وەك خۆر و، دڵۆپێکیان وەك دەریا و، ساتێکیان وەك هەتاهەتایی بەنرخە. مادەم ڕاستی بەم جۆرەیە، کەواتە ئەگەر بە هۆکارێك کە ئەو لێی ڕازی نییە هەموو دونیاش بکرێت بە بەهەشت، لە حوکمی هیچدایە؛ نرخی نییە و بارە بەسەر شانی خاوەنەکەیەوە.

نرخی ئامراز و هۆکارەکان بەئەندازەی گەیاندنی مرۆڤ بە ئامانج و دووربوونی ئەم گەیاندنەیە لە کەموکوڕی. لەم ڕووەوە ئەو هۆکارانەی کە بە ئامانج ناگەن و تەنانەت لەم ڕێیەدا بەربەست دروست دەکەن بە مەلعوون ئەژمارکراون. ئەو لەعنەتەش کە لە دونیا کراوە ڕووی لەم لایەنەیەتی. دەنا ئەم دونیایەی کە ئاوێنەیەکە بۆ هەزار و یەك جیلوە و درەوشانەوەی ناوە پیرۆزەکان و لە شێوەی پێشانگایەکی شکۆداردایە، بەجۆرێکە پێویستە ئادەمیزاد هەم خۆشی بوێت و هەم لە بەرامبەریەوە سەرسامی دەرببڕێت.



چەندەها ڕێگا و ئامراز هەن بۆ پشتگیریکردن و سەرخستنی حەق. ئەم

ڕێنگایانە، بەئەندازەی ڕێزگرتنیان لە حەق و یارمەتیدانیان بۆ گەشەکردنی بیری حەقیقەت بەنرخن. ئەگەر ماڵێك دانیشتووانەکەی ناوی بە مەعریفەت باڵ بگرن و، پەرستگایەك هەموونی بیرۆکەی ئەبەدییەت لەوانەدا بچێنێت کە لەژێر گومەزەکەیدا کۆدەبنەوە و، قوتابخانەیەکیش شاباڵی ئومێد و باوەڕ بە خوێندکارەکانی ببەخشێت، مانای وایە ئەرکی خۆیان وەك ئامراز بەجێدەهێنن و پیرۆزن. ئەگینا هەموو ئەمانە تەڵەی شەیتانین لەبەردەم ئادەمیزاددا. کۆمەڵ و ڕێکخراو و سیاسەتەکانیش بەهەمان شێوە!

***

دامەزرێنەری هەموو دامەزراوەیەك ئیدی بچووك بێت یان گەورە پێویستە زوو زوو ئامانجی دروستبوون و حیکمەتی هەبوونی ئەو دامەزراوەیەی بیری خۆی بخاتەوە. دەنا ئەو دامەزراوە و خوێندنگا و جێگایانەی کە ئامانج و مەبەستیان لەبیرکراون، بەوێنەی مرۆڤێك کە ئامانجی بەدیهاتنی خۆی لەبیرکردووە، بە ناڕاستەیەکی پێچەوانەدا و دژی خۆیان هەڵدەسووڕێن و هەرگیز بە ئامانج ناگەن.

***

نەتیبوونی فیکر و بینینی حەق تەنها لەلای خود، نیشانەی هۆکارپەرستی و نەبوونی ئامانجە. ڕق و قین بەرامبەر بە هەڵگرانی هەمان هەست و بیر ئەگەر بێبەشبوون نەبێت لە بیری ئامانج و مەبەست، دەبێت چی بێت؟! ئاخ لە دەست ئەو بوونەوەرە هەرزەیانەی کە کۆیلەی نەفس و بە خەیاڵی خۆیان گەردوون بەگوێرەی ئەندازەی سەقەتی خۆیان بەڕێوەدەبەن!

# ڕاوێژ

ڕاوێژ بریتییە لە ڕێگایەکی گرنگی بەخشینی سیفەتی بێسنووری بە عەقڵ و بیری سنووردار.

***

هیچ دەوڵەتێك ئەوەندەی ڕاوێژ دەوڵەمەند و هیچ سوپایەکیش هێندەی ئەو بەهێز نییە.

***

قورئانی پیرۆز لە مەقامی مەدح و ستایشی هاوەڵە بەڕێزەکانا دەفەرمووێت ''کاروباری ناو ئەوان بە ڕاوێژە''. بەمەش لەبری هەموو سیفەتە جوان و باشەکانی تریان، سیفەتی ڕاوێژی ئەوان دەخاتە پێشچاو...

***

ئەو ژیرەی کە لە ژیرەکانی دی چەند هەنگاوێك لە پێشترە، ئەو کەسەیە کە نرخ بۆ عەقڵ و بیری کەسانی تریش دادەنێت.

***

کاریگەرترین ئیکسیر کە ژەنگی سەر بیر و بۆچوونەکان پاك بکاتەوە ڕاوێژە.

***

ئەگەر دوو عەقڵ لە عەقڵێك باشتر بن، بێگومان سەد عەقڵ زۆر لە

پێشتر، لە تەنها عەقڵێك. ڕاوێژیش بریتییە لە ناونیشانی کۆبوونەوەی ئەم هەموو عەقڵە.

***

ئەوانەی متمانەیان بە عەقڵی خۆیان هەیە و ناگەڕێنەوە بۆ بیر و بۆچوونی کەسانی دی، لەبەرئەوەی وازیان لە ڕاوێژ هێناوە کە ڕەهەندێکی گرنگ بە داوەریی ژیری دەبەخشێت. ئەگەر بلیمەتیش بن هێشتا بە بێعەقڵ وادەنرێن.

# تەدبیر

تەدبیر بریتییە لە هەڵسوکەوتێکی گرنگ لە کار و بەرنامەکانی مرۆڤدا بۆ ئەوەی لەهەمبەر گریمانی زیانەکان و پاشان لەبەرامبەر بەڵا و موسیبەتەکانی دەرەنجامدا مرۆڤ دووچاری ئاخ و داخ و پەشیمانی نەبێت. چەندین کەسی وەها هەن دەستیان داوەتە کارێك پێش ئەوەی لە بارنەی هۆکارەکاندا ئامادەکاریی تەواوی بۆ بکەن، لە ئەنجامیشدا یان لە ئەژنۆی خۆیان داوە یاخود ڕەخنەیان لە قەدەر گرتووە. بەڵێ، ئەوان سەرەتا لە تەدبیردا کەمتەرخەمی دەکەن و، پاشان بە ڕەخنەگرتنیش لە قەدەر دەکەونە هەڵەی دووهەمەوە.

***

ئامانج و مەبەستی هەر کار و کۆششێك چەند گەورە بێت، ڕەچاوکردنی ئەو تەدبیرانەی کە لەو پێناوەدا پێویستن بەهەمان ئەندازە گرنگن. بەرەمبنای

ئەمە. ئەگەر کەسێك بەئەندازەی گەورەیی ئەو بەرپرسیارێتییەی کە لەسەر شانی ناوە، بیر لە قازانج و زیانەکانیشی ئەکاتەوە و کاروبارەکانی ڕێکئەخات، مانای وایە یان کەسێکی سەرکەشی ناجدییە نییە لەو کارانەدا کە دەستیان دەداتێ، یاخود کەسێکی گەمژەی ساویلکەیە. کار و هەوڵی ئەم جۆرە کەسە گەمژانە لە بێکاری و پاڵدانەوەیان زیانبەخشترە.

***

لە بەدەستهێنانی ئەو شتانەدا کە مرۆڤ ئارەزوویان دەکات، تەدبیرو قایمکاری سەرمایەیەکی گەورەیە. هەر کەموکورتی و پشتگوێخستنێکی کەم کە ئەم لایەنە بگرێتەوە، یەکێکە لەو هەڵە گەورانەی کە لە ئەنجامدا تاوانبارکردنی لێدەکەوێتەوە. کەسی ژێر ئەو کەسەیە پێش ڕوودانی زیانە گریمانکراوەکان ڕێگرییان لێبکات و چارەیان بۆ بدۆزێتەوە. بەڵێ، باپیرانمان وتوویانە "ماڵی خۆت توند ڕابگرە و کەس بە دز مەزانە." هەتا لەنێوان تاوانبارکردنی دز و قەدەردا نەیەیت و نەچیت.

***

پێویستە مرۆڤ بۆ هەموو کارێك ئەخشەی پێشوەختە و تەدبیری هەبێت. هەروەها دەبێت لەو شتانەش دووربکەوێتەوە کە لە ئەنجامدا سوودێکی ماددی و مەعنەوی یان فەزیلەت بە مرۆڤ نابەخشن. هەر کارێك ئەخشە و تەدبیری لەگەڵدا نەبێت بێهوودەیە و، خۆخەریککردن بە شتانی بێهوودەشەوە هێمایە بۆ کەمیی عەقڵ و، منداڵیی خاوەنەکەی دەردەخات.

***

مرۆڤ لە سەرکەوتن لە تاقیکردنەوە سەخت و هەلومەرجە نالەبارەکاندا نرخ

و بەهای خۆی دەسەلمێنێت و دەری دەخات. سەرکەوتن لەو خزمەتانەشدا کە لە هەلومەرجە سەخت و گرانەکاندا ئەنجامدەدرێن، پێش لە هەر شت وابەستەی نەخشەیەکی دروست و جوڵانەوەیە بەپێی ئەو نەخشەیە. بەرەمبنای ئەمە، نرخ و بەهای تاك لەگەڵ سەرکەوتنەکانیدا و، سەرکەوتنەکانیشی لەگەڵ ئەو بڕیارانەی کە پێش دەستدانە کارەکانی دەیدات، ڕاستەوانە دەگۆڕێت.



هەروەك تەدبیر بەتەواوەتی جیاوازە لە ترسان و کشانە دواوە، ئەو کارانەش کە بێ تەدبیر دەکرێن هیچ پەیوەندییەکیان بە ئازایەتی و دلێرییەوە نییە. لەڕاستیدا لە جۆری یەکەمیاندا کاتێك زیادەڕەوی دەکرێت هەندێك زیان دروست دەبن؛ بەڵام ئەم زیانانە بەدڵنیاییەوە لاوەکین و دەگونجێت چارەسەریان بۆ بدۆزرێتەوە. وەلێ جووڵانەوەی ئاشکرا و بێبەرەوای ئەوانەی کە بێ تەدبیری بە قارەمانێتی ئەژماردەکەن و ڕەفتاری "دۆن کیشۆت"ئامێزیان[1] هەیە، هەمیشە مەترسیدار و زیانبەخشە.



پۆپولیزم کە خەڵەتانێکی تەواو ڕووتە و بریتییە لە خۆدانە دەست حاڵەتی دەروونی کۆمەڵانی خەڵك و پاشان بەکارهێنانی بۆ ڕاوکردنی هەست و سۆزی خودی کۆمەڵانی خەڵك، بەرتنەی هەر سیفەتێکی دیکەی خراپ، ئیبارەی ڕازەنارایە بۆ ئێمە. بەگوێرەی لایەنگرانی ئەم بۆچوونە لارولێرە،

[1] دۆن کیشۆت ڕەتییە لە کاراکتەری ڕۆمانێکی نووسەری ئیسپانی "سێرڤانتیس". لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەورووپا خەڵکی گرنگییەکی زۆریان بەو کتێبانە دەدا کە داستان و بەسەرهاتی سوارچاکەکانی دەگێڕایەوە. نووسەر لەم ڕۆمانەدا لە ڕێگەی کەسایەتی "دۆن کیشۆت"ەوە گاڵتە بەم حاڵەتە دەکات. دۆن کیشۆت پیاوێکی لەرکەسە ساویلکانەی کە لە ئەنجامی خوێندنەوەی بەردەوامی ئەم جۆرە کتێبانەدا خۆی لێبووە بە سوارچاك و، ئاشەکانی لێبووە بە دوژمن و، هێرش دەکاتە سەر ڕانەمەڕەکان بە گومانی ئەوەی سوپای دوژمن بن!

چەندەها گارەگار بەژوور سەری هێلکەیەکەوە شتێکی ئاساییە. بەڵام بەڕای ئێمە پێویستە هەموو بابەتێکی میللی لە چوارچێوەی سەبر و بێدەنگییەکی مەرجانیدا و، لە چەپەکترین شوێندا و، بەجۆرێك کە لەگەڵ حاڵەتی پڕ لە ژان بەڵام خامۆشی جووجەڵە مەرجانییەکاندا بگونجێت، مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.



گەورەیی ڕێگەی مرۆڤ لای خوا بەئەندازەی گەورەیی هیممەتیەتی. دیارترین نیشانەی هیممەتبەرزیش بریتییە لە بەختکردنی حەز و چێژە کەسییەکان لەپێناو بەختەوەریی کەسانی دیکەدا. نازانم داخۆ سەبارەت بە مرۆڤ بەدەر لە ژێرپێخستنی شەرەف و نامووسی خود لەپێناو سەلامەتیی میللەتدا و، تەنانەت خواردنەوەی تووڕەیی و دانبەخۆداگرتن لە جێیەکدا کە پێویستە هاواربکات و بنەڕێنێت و، باج خستنە سەر بەختەوەریی کەسی لە هەر جێیەکدا کە بێتە پێشەوە، دەکرێت وێنای فیداکارییەکی گەورەی دیکە بکرێت؟!



بەستنەوەی هەموو سەرکەوتنێك لە سوپاکاندا بە هەڵمەتەوە و گرنگینەدانی ئەرکانەکانی بە پلان و نەخشە سەربازییەکان چەند بێعەقڵییە، بەستنەوەی سەرجەم سەرکەوتنەکانی کەسێك بە ئازایەتیی کوێرانەوە و گرنگینەدان بە تەدبیریش بەهەمان جۆر بێعەقڵییە.



تەدبیرەکانیش بەرنەی هەوڵدانەکان، وەکو بانگهێشتنامەیەك وان کە

پێشکەش بە کۆمەکی خوای گەورە کراون و، دوو ڕووی یەك حەقیقەتن.
کەمرکورتی لە یەکێك لەمانەدا زۆرجار دەبێتە هۆکاری بچڕانی عینایەت
و لەئەنجامیشدا شکست و سەرنەکەوتن. ڕۆیشتنی بێ کەمرکوڕی بە
ڕێگایەکەدا بەوە دەبێت کە لە هەموو ساتێکدا چاوی بەسیرەت کراوەبێت.
خۆشبەختی بۆ ئەوانەی پەی بەمە دەبەن!

## ئارامگری

ئارامگری، بەرتنەی گیادەرمانێکی تاڵ، هەم ئازادی مرۆڤ دەدات و
هەم تیماری دەکات.

***

هەموو کێشە و ناڕەحەتییەك سکپڕە بە گوشادی و ڕزگاربوون، بەڵام
پێویستە لە ماوەی سکپڕیدا مرۆڤ ئارامگر بێت.

***

ئارامگری و دامەزراوی لەگەڵ سەرکەوتندا دوانەن ئەگەرچی بەڕواڵەت
لەیەکتر جیاوازن.

***

دەریاکان لە دڵۆپەکان پێکدێن، بەڵام کەس ناتوانێت ماوەی پێویستی نێوان
دڵۆپ و دەریا بهێنێتەوە یەك...

***

نارامگری و لەسەرخۆیی نموونەییترین ڕێگای سەرکەوتنە خوازراوەکانە.

***

لە خەرمانی کەسێکدا کە پەلەپەل دەکات و هەڵەشەیە زۆرترین شتێك ی دەدۆزرێتەوە هەڵەیە.

***

ڕێگای لوتکەکان لە دۆڵەکانەوە دەست پێدەکات.. بێگومان بۆ کەسانێك کە نارامگرن..

***

ئەگەر شتێك هەبێت سەرەتاکەی ژەهر و کۆتاییەکەی شەکر و شەربەت بێت، ئەوە صەبرە.

***

نارامگری بریتییە لە ناونیشانی ڕەفتاری ئەرێنی لەهەمبەر ڕووداوەکانەوە؛ لەبەرئەوە مەردانی خوا داواکردنی صەبریان پێش لە وادەی خۆی بە شتێکی گونجاو نەزانیوە.

# بەرگەگرتن نەک زویربوون

کاتێك دەورووبەر هێشتا دەیجوور بوو، ئەوە تۆ بوویت کە پەیامەکانی خوات دەدا بە گوێی چواردەوردا. ئەگەر قەدرنەشناسەکانیش پێی نەیزانن، خۆ ئاسمان و زەوی شایەتن لەسەر ئەمە. ئەکەیت چاو لە حاڵی نادانەکان بکەیت

و سکاڵا بکەیت! ئەو خزمەتەی دەیکەیت ئەگەر خەڵکیش ستایشی نەکەن خۆ خوا دەیبینێت!

***

تۆ داخوازی و پێداویستیی خۆو ڕەوشتت جێبەجێکرد و ئەمێستا چواردەورت وەك لالەزار وایە... لەکاتێکدا ئەم هەموو گوڵە دەوری داویت، بۆچی سکاڵا لە دەست سێ چوار دڕك دەکەیت؟ بەتایبەت ئەگەر ئەم بەدبەختییە بەرچەکردارێك بێت لە دژی کەموکورتی و ناتەواوی لە ڕێگەیاندندا!

***

سەبارەت بە دڵێك کە وابەستەی خوای گەورە بووە، ئایا داواکردنی پاداشتی ئەو خزمەتانەی کە لەپێناو قیامەتدا کراون لە دونیادا هەڵسوکەوتێکی هیچەدیو و نادانانە نییە؟ ئەی دونیا و شتانی ناوی فانی و، ئاخیرەتیش بە خۆی و جوانیی و شکۆمەندییە سەرسوورهێنەرەکەیەوە باقی و هەتاهەتایی نییە؟ کەواتە وەرە! واز لە پاداشتی ئەو هەوڵ و کۆششەت بهێنە کە لە ڕێگای خوادا داوتە! جیهانەکانی ئەودیو هەزاران دونیا دەهێنن.

***

نابێت ڕووتێکردنی خەڵکی ئەگەر لەسەر حەقیش بن وەك نیشانەی گەورەیی خۆت ئەژماربکەیت و پشت بەو پلەوپایانە ببەستیت کە خەڵکی بە گومانی باشی خۆیان پێیان بەخشیویت. وە هەرگیز نابێت دووچاری دەردی خۆبەگەورەزانی بیت و خەڵك لە خۆت بە بچووکتر ببینیت! چونکە بەها و پێگەی مرۆڤ لای خوا، بەگوێرەی پاکێتی ڕۆح و مەزنیی دڵە. گرنگیدان بە جیسمانییەت و لەبیرنەچوونەوە لەژێر گۆشت و ئێسقاندا بەدبەختییەکی چەند تاڵە!

***

هەستی ڕێزگرتن لە گەورەکان ئەگەر بناغەش بێت، نابێت بۆ خۆت داوای بکەیت. ڕێز و حورمەتی خەڵکی بەرامبەرت بێنەوەی داوای بکەیت و چاوەڕێی بکەیت زیانی نییە، بەڵام ئەگەر ئارەزووی بکەیت و بەدوایدا ڕابکەیت، وەکو یارێکی دەستپێنەگەیشتوو لێدێت و مرۆڤ لە ژان و زەبوونیدا جێدەهێڵێت.

***

نابێت پشت بە گەورە زانین و گەورە نیشاندانی خەڵکی ببەستیت! گەرچی ڕووتێکردنێکی لەم جۆرەی خەڵکی ئەگەر ڕەنگدانەوەی ڕەزامەندیی ی جیهانی غەیب بێت بە شتێکی قبووڵکراوە هەژماربکرێت، بەڵام هەرگیز شتێك نییە ئارەزوو بکرێت. ئەگەر بۆ ساتێکیش مرۆڤ دڵخۆش بکات، زۆرجار دەیگریەنێت و دەیتلێنێتەوە. نابێت بە ستایشی ڕاگوزەری لەم جۆرە بخەڵەتێیت و دەروونت ڕەش بکەیتەوە!

***

ئایا هەرگیز بیرت لەوە کردووەتەوە کە بەئەندازەی گەشەکردن و گەورەبوونی خزمەت، بەرەنەی دوژمنەکانت، بە چواردەورەکەشت تاقیدەکرێیتەوە؟ ڕابمێنە! وە جوامێربە بەرامبەر بەو دۆستانەت کە لە دەستی خوای گەورەدا هەریەکێکیان ئامرازێکی تاقیکردنەوەن!

***

ئەکەیت ئەو خزمەتەی کە لەپێناو میللەتەکەتدا ئەنجامی دەدەیت و ئەو چاکانەی کە بەرامبەر بە چواردەورەکەت دەیکەیت بیلەیتەوە بە چاویاندا و، لە

خۆت بێزاریان بکەیت! لەبیرت نەچێت ئەو شتانەی کردووتن هەریەکە ئەرکێکن و، تۆش فەرمانبەر و لێپرسراونێکیت!

***

ئەگەر بەئەندازەی ئەو کتێبانەی دەیانخوێنیتەوە و، ئەو بابەتانەی بیریان لێدەکەیتەوە و شییان دەکەیتەوە و، بە هەناسەبڕکێ لە ڕێگای خوادا خزمەت دەکەیت، مەحو نەبیتەوە و "قەهر و لوتف" وەك یەك تەماشا نەکەیت، بیر لەوە بکەوە کە لە هەموو جوولەیەکتدا دەبیت بە تەڵەی پەنجە تیژەکانی مێنتییەوە و، لە ترسی ئەمە هەڵبلەرزە!

***

تکایە بە هیچ جۆرێك باسی ئەو خزمەتانەی کردووتە و باڵای ئەو فیداکارییە زۆرانەی ئەنجامت داوە لای من مەکە! ئەگەر دەتوانیت ئەو بەرهەمانەی لەسەر دەستت هاتوونەتە گۆڕێ بە مولکی میری بزانیت و، وەکو لوتفێکی خوایی تەماشایان بکەیت کە لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششی هاوڕێیانت بەخشراون و، لە خزمەتکردندا لە پێشی پێشەوە و لە کاتی کرێ و پاداشتدا لە دوای دواوە بیت، تکات لێدەکەم، تا ئەوەم بۆ باسبکە! بۆم باس بکە هەتا زمانی شیرینت دڵم ئاوەدان بکاتەوە.

***

مەڵێ "زانستەکەم، عیززەتم، شەرەفم" و، بە گۆرانییەکانی تایبەت بە نەفس دوژمنەکانت دڵخۆش و دۆستەکانت دڵتەنگ مەکە! ئەگەر بەهرە و لێهاتنێکت هەیە، وازی لێبهێنە با لەو دونیا گوڵ بکات و میوەبگرێت! ئەگەر زێنت داستان بێت، با وەك نەغمەی ئەبەدیی فریشتەکان بمێنێتەوە.

# دامەزراوی و هەڵگەڕانەوە

دۆزینەوەی حەقیقەت و دڵنیدان پێی چەند گرنگ بێت، وەفاداری و دامەزراویش لەدوای دۆزینەوە بەهەمان ئەندازە گرنگن و پێویستە بەجددی هەڵوێستەیان لەسەر بکرێت. لەڕاستیدا کەسێک کە لە ڕۆحیدا بە ڕووناکیی حەقیقەت گەیشتووە، بەئاسانی ڕێ و ناڕاستە ناگۆڕێت! هەرچی ئەوانەیشە کە بەیانی و ئێوارە بەبێ وەستان قیبلەی خۆیان دەگۆڕن، کۆمەڵێک بەدبەختی وەهان کە حەقیقەتیان نەدۆزیوەتەوە، یاخود کەسانێکی بێدەرکن کە لە نرخ و بەهای حەقیقەت تێنەگەیشتوون.

ئەو بەختەوەرانەی دڵیان کردووە بە کەناراوێک بۆ زەریای حەقیقەت، هاوڕێ لەگەڵ شەوق و ئیشتیاقێکدا کە تێربوون نازانێت، شەپۆلەکانی ئەو زەریایە لە سینەی خۆیاندا دەتوێننەوە و، هەمیشە دەڵێن "زیاتر نییە؟!" ئەمانە کەسانێکن گەڕانیان تەواوکردووە و، میحرابی خۆیان دیوەتەوە و، ڕۆحیان دامەزراوە. هەرچی ئەوانەیشە کە هەردەم لە شەپۆلداندان، یان کۆمەڵێک نادانی وەهان کە شێوازی گەڕان نازانن، یان کۆمەڵێک بێمەتڵی وەهان کە گەڕان و دۆزینەوەیان تێکەڵکردووە. تەنها ئەو کەسانە دەدۆزنەوە کە دەگەڕێن؛ ئەوانەش کە دەدۆزنەوە لە جێی خۆیاندا دامەزراو دەبن؛ ئەو سەرگەردانانەش وادەزانن ئەو شتەیان دیوەتەوە کە بەدوویدا دەگەڕێن، بەدرێژایی تەمەنێک لەهەمان شوێندا دەخولێنەوە.

***

مانەوە لە جێگای خۆدا و پاراستنی سەنگەر و پێگە، یەکەم هۆکاری سەرکەوتن بەسەر دوژمن و گەیشتن بە ئامانجە. ئەوانەش کە سەنگەر جێدەهێڵن، لەو ساتەوە کە لێی جیادەبنەوە چوونەتە سەر ڕێگای شکست و دۆڕان.

***

هەموو هەڵاتوویەکی سەنگەر، سەرەتا لە ویژدانی خۆیدا و، پاشان لەبەرامبەر مێژوو و نەوەکانی داهاتوودا خۆی مەحکووم دەکات و، لەئەنجامیشدا بەپێچەوانەی مەبەستەکەی خۆیەوە زللە دەخوات. دامەزراوی و پاراستنی سەنگەر لە هەموو دەعوا و پەیامێکی مەزندا، نیشانەی دلێرییە. ئەوانەش کە کۆیلەی نەفسن و لە کورتەوە با بێت لەوێوە شەن دەکەن، ئەگەر لەمە تێنەگەن و نەیانەوێت تێبگەن، مرۆڤێك کە مرۆڤی ڕاستەقینە بێت، پاش ئەوەی یەك جار لە حەقیقەت تێگەیشت و دەرکی کرد، ئیدی بەرژەوەندییەکان ناتوانن زنجیر لە قاچی بدەن و، ترس سەری ڕێی پێنەگرێت و، شەهوەت بەخەی ناگرێت. ئەو هەموو ئەمانە تێدەپەڕێنێت، وەك ئەوەی بە هەوادا و بەسەریاندا بفڕێت.

***

ئەوانەی لە خزمەتێکدا بەبەردەوامی بیر و پێگە دەگۆڕن، هەرووەك متمانە و باوەڕیان بە خۆیان نامێنێت، هاوڕێکانیشیان هەمیشە گرفتاری نائومێدی دەکەن. هەرووەك چۆن ئەگەر کەسێك لە کۆمەڵێك بچێتە دەرەوە کە بە عەشق و شەوقەوە ڕێدەکەن، ڕیتمی جوولەی بەکۆمەڵ تێکدەچێت و دەبێت بە هۆکاری تێکچوون، بەهەمان جۆر جیابوونەوەی کەسێك لە کۆمەڵێك کە لە دەوری

مه‌فکووره‌یه‌ك و نامانجێکی ده‌ستیان داوه‌ته ده‌ستی یه‌ك. دۆستان تووشی له‌رزین و ڕه‌شبینی و خه‌یاڵشکان و، دوژمنانیش نوقمی خۆشی ده‌کات.

***

ئه‌وانه‌ی زوو زوو به‌ڵێن و په‌یمان ده‌شکێنن و تووشی بێقه‌راری ده‌بن ڕۆژێك دێت که متمانه و باوه‌ڕیان به خۆشیان نامێنێت و، ورده ورده ده‌چنه ژێر کاریگه‌ریی که‌سانی تره‌وه. ئه‌م ڕۆحه ئیفلیجانه‌ی که به تێپه‌ڕبوونی کات به‌ته‌واوه‌تی که‌سایه‌تییان له‌ده‌ست ده‌ده‌ن، ده‌بن به لایه‌نێکی زیانبه‌خش هه‌م بۆ خۆیان، هه‌م بۆ ئه‌و کۆمه‌ڵگایه‌ش که تێیدا ده‌ژین.

***

ئه‌وانه‌ی ئه‌مڕۆ ده‌بن به‌ژێر هه‌ندێك حساباتی بچووکه‌وه و، قاچیان له شانی وه‌ك پله‌وپایه و ناوبانگ و شه‌هوه‌ت ده‌گیرێت، نازانم داخۆ ئه‌و ڕۆژانه‌ی که به‌رژه‌وه‌ندییه‌کان وه‌ك په‌لکه‌زێڕینه ناسۆمان ده‌ته‌نن و، ترس و ئه‌ندێشه‌کان ئیراده‌مان کۆت و زنجیر ده‌که‌ن، چی ده‌که‌ن؟!

***

له مێژووی مرۆڤدا شاره‌کان و قه‌ڵاکان به هه‌وڵ و تێکۆشان و خوێنی هه‌زاران دلێر و بوێر به‌ده‌ستهاتوون. به‌ڵام زۆرجاریش به‌هۆی ڕه‌فتاری ناپاك و نامه‌ردێك بۆ هه‌تاهه‌تایه له‌ده‌ستدراون. له‌م باره‌یه‌وه ته‌نها ئه‌و ڕووداوانه‌ی که تایبه‌تن به یه‌ك گه‌ل، هێنده زۆرن که له فه‌رهه‌نگه‌کاندا جێیان نابێته‌وه...

***

ئاخ ناوبانگی بکوژ و، شه‌هوه‌تی بێئیمان و، ته‌ماعی نامه‌رد! چه‌نده‌ها ڕۆح ته‌نها به یه‌کجار سه‌ردانی گه‌ره‌کی ئێوه زه‌رد و سپی هه‌ڵگه‌ڕان.

چەندین دڵ لە هەرێمی نێوەدا وەکو گەڵای پاییز هەڵوەرین. وە چەندین باڵای سەرووناسا بەهۆی قاتا شوومەکەی نێوەوە، لە پەرستگاوە بەرەو مەیخانە گواستییەوە. بەڵێ، ئەو پاڵەوانانەی ڕێیان لە هەرێمی نێوە هەڵکەوت، ترسنۆک و فسۆک دەرچوون و، لاوەکانیش پیر و پەککەوتە کەوتن.

## باوەڕدار جارێک دەخەڵەتێت

هەموو ئامانجێکی باڵا و مەفکوورەیەکی مەزن سەرەتا لە بیرکردنەوەی سیستەماتیزەکراو و نەخشەیەکی تەندروستدا دێتە بوون و، لایەنگر بۆ خۆی دەدۆزێتەوە و، ڕۆژانە چەند جارێک دەبێت بە میحرابێک بۆ ڕووتێکردنی شۆڕشگێڕانی. ئەو بیر و دەعوایانەی ناتوانن ئەم جۆرە پاڵپشتی و بناغەیە بدۆزنەوە، پێش لەدایکبوون دەمرن.



نابێت ئەو پاڵپشت و هێزانەی کە بوون و نەبوون و کۆبوونەوە و شێبوونەوەیان تایبەت نین بە ئێمەوە، هەرگیز هیچ حوکم و بانگەوازێکمان لەسەر بنیاتبنرێت. ئەوانەی بەدیهاتنی ئامانجەکانیان بەم شتانەوە بەستووەتەوە هەمیشە فریویان خواردووە و. ئەوانەش کە داهاتوویان لەسەر بنیاتناوە، بوون بەژێر داروپەردووەکەیەوە.



لە دەعوایەکدا هەریەک لە مەزنیی مەفکوورە و، پتەویی بیر و نەخشە و، گەرموگوڕی و ئیخلاصی نوێنەرانی ئەو بانگەوازە، چەند لایەنێکی زۆر

گرنگن. ئەوەندە هەیە هەڵبژاردنی هۆکارەکان و ئامرازەکانی هەر کارێك کە نەخشەی بۆ کێشراوە و، گونجانیان لەگەڵ ئەنجامە چاوەڕوانکراوەکانیدا، بەهەمان ئەندازە گرنگن. ئەوانەی لەگەڵ کۆمەڵێك هۆکاردا کەوتوونەتە ڕێ کە دیارنییە داخۆ مرۆڤ بە ئامانج دەگەیەنن و، پاڵپشتیی دادگایەکی بەرزیان بەدەستنەهێناوە، هەروەك ئەو کەسانە دەخەڵەتێنن کە پشتیان پێبەستوون و دووچاری نائومێدییان دەکەن، زیانیش بە خۆیان دەگەیەنن.

***

پێویستە حەق دیسان لەسەر حەق بنیاتبنرێت و، لە ڕاسترین ڕێگاکانەوە مرۆڤ بەدوایدا بگەڕێت. گەڕان بەدوایدا لە هەرێمێکدا کە تێیدا بیری حەق ناناسرێت غەفڵەتە و، هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی لە ڕێگەی هۆکارە ناحەقەکانیشەوە فریوخواردنە.

***

شتانی ئەرێنی لەسەر بیر و بۆچوونی ئەرێنی و میکانیزمی ئەرێنی بنیاتنانرێن. ڕێگەی شتە ئەرێنییەکان لەناو ئەرێنییەکاندا. پێویستە وەك ڕۆیشتن وابێت بەناو کۆمەڵێك دەرگادا کە دەکرێنەوە و دادەخرێن. پێویستە ڕۆیشتن بەردەوام بێت، بەڵام بە هیچ جۆرێك پێکدادان ڕوونەدات.

***

حەقیقەتە هەمیشەییەکان بە شتانی بگۆڕ و کاتییەوە نابەسترێنەوە. دامەزرانی دامەزراوە هەرە گرنگەکانی ژیان لەسەر دورگەیەك کە لە ناودا مەلە دەکات چی بێت، خزمەت کردنیش لە سیستەمێکدا کە ئیدارە و جڵەوەکەی لە دەستی هێزە جۆراوجۆرەکاندایە، هەمان شتە.

# دژیەکەکان

بیر لە پاکژبوونەوەی هزر و هەست و، گەشەپێدانی توانا و لێهاتنە مرۆییەکانت دەکەیتەوە؛ بەبێ قوتاربوون لە چێژە جەستەییەکان و، یاخیبوون لە ئارەزووە ئاژەڵییەکان، ئەمە کەی کارێکی کردنییە؟!

***

دەخوازیت لە زیانی دڵتدا بە "تەوحید" بگەیت و لە چێژە ڕۆحییەکاندا نوقم ببیت، کەچی هەزار و یەك هەستی خراپ لە ناختدا دێن و دەچن و، لە هەموو سەر سووچێکدا بە چێژە جەستییەکان دەڵێیت "بەڵێ". ئەم دووانە پێکەوە چۆن هەڵدەکەن؟!

***

خەیاڵی ئەوە لێدەدەیت کە باڵ بگریت و پەرواز بکەیت و بەرز ببیتەوە و بگەیت بە جیهانەکانی ئەودیو، بەڵام وەك منداڵێك وابەستەی خاك و قوڕی دونیایت؛ ئەم دووانە چۆن پێکەوە دەلوێن؟!

***

چاوەڕێیت هەمیشە لە ناسۆتدا سپێدەی نوێ هەڵبێت، بەڵام هەتا دڵت بە ئامانجە مەزنەکان پڕچەك نەکەیت و، پێگەکەی جارانت بەدەست نەهێنیتەوە و، وەکو زایەڵەیەك لە سینەی دونیادا نەناڵێنیت، ئەمە چۆن مسیسەر دەبێت؟!

***

دەتەوێت چارەسەر بۆ ئەو کێشانە بدۆزیتەوە کە بەدرێژایی چەندین سەدە کەڵەکە بوون، بەڵام ئەگەر عەزم و ئومێدت نەبێت و، بڕیار نەدەیت کە لەم ڕێگایەدا چەندین ساڵ و چەندەها سەدە چاوەڕێ بکەیت، چۆن دەبێت؟!

***

باس لە پێشکەوتنی نیشتمان و بەختەوەریی مرۆڤی ئێمە دەکەیت، بەڵام ئەمە چۆن دەبێت ئەگەر بە سیانەی قوتابخانە و سەربازگە و تەکیە شاباڵ بە نەوەکانت نەبەخشیت و، هێرش نەکەیتە سەر هەموو سێگۆشەکانی شەیتان؟!

***

دەتەوێت بگەیت بە وجود و لەسەر ئاستی هەستەکانت بە کامی دڵی خۆت تامی ژیان بکەیت، وەلێ ئەگەر هەتا ئێوارە بەبێ شکاندنی ڕۆژووەکەت بەردەوامی بەم کاروانە نەدەیت، جا چۆن بەوە دەگەیت؟!

***

دەتەوێت هەمیشە لەبەر چاوان و لەناو دڵاندا بیت و چەپڵەت بۆ لێبدرێت و ببرێیت بە ئاسماندا، کەچی ڕۆژی سەد جار عەهد و پەیمان دەشکێنیت، ئیدی چۆن دەگەیت بەوەی دەتەوێت؟!...

***

خۆت پێ تەواو و کامڵە و حەز دەکەیت هەموو کەسێکیش بەم جۆرە بتناسێت، لەکاتێکدا حاڵ و ڕەفتارەکانت پێچەوانەی ئەمەن و ڕۆژانە باری هەزار گوناهت لەسەر شانە! ئیدی چۆن ئەمەت دەست دەکەوێت؟

## بیری خزمەت

ژیانێك كە تێیدا خزمەتكردنی خوا و خەڵك ئامانج نەبێتە چ جیاوازییەكی لەگەڵ ژیانێكی وەحشییانەدا هەیە كە تێیدا هەزار و یەك هەڵپە جرت و فرتیانە؟!

•••

ستایشكردنی هەموو جۆرە جووڵەیەك كە بەئاڕاستەی ڕاستی و حەقدا بێت، نیشانەی ڕێزگرتنی حەقە. ئەوانەی حەق تەنها لە ڕێباز و مەشرەبی خۆیاندا دەبیننەوە، باوەڕبكەن هەروەك زۆر نابات كە بەتەنها دەمێننەوە. لە تێگەیشتن لە حەقیشدا هەمیشە گۆڕانكارییان بەسەردا دێت و هەرگیز بە دامەزران "جێگیری" ناگەن.

## نماینده لە هەموو ئاستێكدا

سەبارەت بە نوێنەر و نماینده ئیدی لە هەر ئاست و پێگەیەكدا بێت سیفەتەكانی وەك ڕاستی و، ئەمانەتپارێزی و، هەستی لێپرسراوێتی و، ئیدراك و تێگەیشتنی بەرزتر لەچاو هاوشێوەكانیدا و، سیفەتی بینینی سەی لەگەڵ ئەمڕۆدا و، ژیانێكی پاكدارێنانە سەرەڕای هەموو شتێك، زۆر گرنگن. لەدەستدانی یەكێك لەم سیفەتانە سەبارەت بە كەسێكی ئیداری، كەموكورتییەكی جددییە و، سەبارەت بەو لایەنەش كە ئەو كەسە نوێنەرایەتی دەكات چارەڕەشییە.

# یەکێتیی نێوان ناوەوە و دەرەوە

ئەوانەی دەیانەوێت دونیا چاکبکەن، سەرەتا دەبێت خۆیان چاکبکەن. بەڵێ، سەرەتا پێویستە ناوەوەیان لە ڕق و نەفرەت و حەسوودی و، دەرەوەشیان لە هەموو جۆرە هەڵسوکەوتێکی نابەجێ پاکبکەنەوە، هەتا ببن بە نموونە بۆ دەوروبەریان. پەیامی ئەو کەسانەی کە ناوەوەی خۆیان کۆنترۆڵ نەکردووە و، لەگەڵ نەفسیاندا نەجەنگیون و، ئەتحی دونیای هەستەکانی خۆیان نەکردووە، چەند ڕازاوە و جوانیش بێت، جۆشوخرۆش لە ڕۆحەکاندا بەرهەمناهێنێت و، ئەگەریش بیکات بەردەوامنابێت.

# ڕۆحی نموونەیی

ئەو کەسانەی لەپێناو ڕۆشنکردنەوەی خەڵکیدا هەوڵدەدەن و، هەمیشە بۆ بەختەوەرییان پەلەقاژە دەکەن و، لە هەڵدێرە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا دەستی یارمەتییان بۆ درێژدەکەن، کۆمەڵێك ڕۆحی مەزنی وەهان کە پەیییان بە خۆیان بردووە و، لە کۆمەڵگاکەیاندا بەوێنەی فریشتەی پارێزەر، ڕووبەڕووی ئەو کێشە و گرفتانە دەبنەوە کە هێرش بۆ سەر کۆمەڵگا دەهێنن و، سنگ لە زریانەکان دەردەپەڕێنن و، بەرەو ڕووی ئاگرەکان دەڕۆن و، لەهەمبەر لەرزینە گریمانکراوەکانیشەوە هەمیشە لە ئامادەباشیدان.

***

لە بابەتی هەڵبژاردنی پیشەدا، کردنی گونجانی پیشەکە لەگەڵ بانگەواز و ئیرشاد و تەبلیغدا بە پێوەر، نیشانەی ترخشناسی و ڕێزگرتنی حەقیقەتە. ئەوانەی لەبەرامبەر بانگەوازە جۆراوجۆرە سەرنجڕاکێشەکانی چواردەوریانەوە بەبێ لەرزە لەم ڕێیەدا ڕێدەکەن، دەبن بە ئەندازیارە بەختەوەرەکانی داهاتوو.

## ئیرادە بەهێزەکان

ئیرادە و کەسایەتییە بەهێزەکان ئەگەر هەزاران جار لە مەنجەڵدا بکوڵێنرێن و، چەندەها جار لە قاڵبی هەمەجۆردا دابڕێژرێن، دیسانیش هیچ شتێک لە کەسایەتیی خۆیان لەدەستنادەن و ناوەرۆکی خۆیان دەپارێزن. ئەی دەبێت چی بوترێت بەو بەدیهاتووە بێئیرادانەی کە ڕۆژی چەند جارێک بیر و ئاراستە دەگۆڕن؟!

## غەریبەکان

غەریب ئەو کەسە نییە کە لە ماڵ و نیشتمان و دۆست و کەسەکانی دابڕاوە. بەڵکو ئەو کەسێکە لەو دونیا و کۆمەڵگایەدا کە تێیدا دەژی، خەڵکی لە حاڵ و ڕێبازی تێناگەن؛ کەسێکە لە ئەنجامی ئامانجە باڵاکانی و، بیر و بۆچوونی دەربارەی جیهانەکانی غەیب و، بەختکردنی چێژە کەسییەکانی لەپێناو کەسانی تردا و، هەوڵ و هیممەتە بەرزەکەی، زوو زوو لەگەڵ هەلپەرست و بەرژەوەندیخوازەکاندا دژ دێتەوە و، ڕەفتارەکانی لەلایەن چواردەورەکەیەوە وەك غەریب و نامۆ تەماشادەکرێن.

## ڕۆحی میللەت

ڕێگای ئێمە بریتییە لە ستایشکردنی هەموو کار و هەوڵێکی خێر کە لەپێناو میللەت و نیشتماندا بکرێت. هەرگیز بە (تکفیر) و (تظلیل) وەڵامی هیچ کەسێك نادەینەوە و، "ئامین" بۆ لەعنەت و دوعای شەڕ ناکەین!

# بیری یەکگرتن

هەموان داوای تەسلیمبوون دەکەن بە ڕێبازەکەی خۆیان و داوای "سیلم" ناکەن. لەکاتێکدا خوای گەورە دەفەرمووێت (اُدْخُلُوا فِي السِّلْمِ كَافَّةً)!

***

ئەگەر ناشتوانین یەک بگرین با هیچ نەبێت تووشی دووبەرەکی و دابڕان نەبین، یان بابەت و جیاوازییەکانی نێوانمان گەورە نەکەین.

***

لوتفی تایبەتی خوای گەورە لەگەڵ جەماعەتدایە، بەجۆرێك تاکە هەرە دەگمەن و بلیمەتەکانیش سەرەڕای هەموو هەوڵێکیان ناتوانن بەدەستی بهێنن.

# سەرەتا نەخشە

کاتێك نەخشە بۆ کار و پرۆژەیەك دادەڕێژرێت، پێویستە لەپاڵ هۆکارەکاندا بەربەستە گریمانکراوەکانیش یەك بە یەك هەڵوێستەیان لەسەر بکرێت؛ بۆ ئەوەی دواتر لە کاتی دەرکەوتنی کێشە و گرفتەکاندا نە ڕەخنە لە ئەدەر بگیرێت و نە متمانە و بڕوای خەڵکیش بەرامبەرمان بلەرزێت.

# پلان

کاتێك کارگەیەك لەسەر نەخشەیەکی پتەو و بەهێز دادەمەزرێنرێت بەردەوامی و نایینەمیەکی گەشی دەبێت. بەڵام ئەگەر لە بناغەکەیدا فیکرێکی مەحکەم و حسابێکی ورد بوونی نەبێت بەحەتمی دووچاری شکست دێت. ئەی دەبێت کارەکانی تایبەت بە میللەت و، ئیدارەدانی دەوڵەت و، بەرزکردنەوەی مرۆڤ کە هەموو لایەنێکی مەتەڵێکی جیاوازە بۆ ئاستی مرۆڤێتیی ڕاستەقینە. دەبێت چۆن بن؟!

# ئەنجام

هێشووی کۆتایی گرنگە، نەك باقوبریق و هاشوهووشی سەرەتا.

***

چارەنووسی ئەو کارانەی کە بیر لە سەرەنجامیان نەکراوەتەوە، زۆرجار بە پەشیمانی کۆتایی دێت.

***

پاسەوانیی کوڵانە بە ڕێوی ناسپێررێت!

***

پێکەنینی کۆتایی، پێکەنینی ڕاستەقینەیە.

***

ئەو قەیماغ و هەنگوینەی ئەمڕۆکە سبەینێ تامی تونی و سوێریت پێ دەچێژێنێت، لە ژەهر تاڵترە.

***

دەگونجێت زۆرێك لەو شتانەی وادەزانرێت زیانبەخشن لە ئەنجامدا سوودبەخش بن، پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە...

***

کۆتا خاڵی تەنگی و ناڕەحەتی، سەرەتای ئاسوودەیی و گوشادییە.

## مەردی خاوەن دەعوا

پاڵەوانانی بواری حەقیقەت مەرج نییە خاوەن پۆست بن.

***

مەردی خاوەن دەعوا نە لە سەرکەوتن و نە لە شکستدا ڕەفتاری خۆی ناگۆڕێت.

***

هەموو چاوەڕوانی و داواکارییەك هەتا لە ماڵەکانی هاوشێوەی ماڵی ئمی ئەرقەم'دا پێنەگات، واتە هەتا لەگەڵ ئارامگریدا نەکوڵێت و پێنەگات، خەیاڵێکی خاوە.

# ئامراز و ئەنجام

ئامرازی ناحەق مرۆڤ بە ئامانجی حەق ناگەیەنێت. هۆکار و ئامرازە بەکارهاتووەکانیش پێویستە حەق و مەشرووع بن.

# هۆکاری ناحەق

ئەو سیستەمانەی کە لەسەر درۆ و بانگەشەی بێبنەما بنیاتنراون، ئەگەر تەمەنیشیان درێژ بێت، زوو یان درەنگ بەسەر خاوەنەکانیاندا دەڕووخێن و، لەدوای خۆیان خەونێکی تاڵ و خەیاڵێکی پڕ لە حەسرەت جێدەهێڵن.

# حەزی خۆشگوزەرانی و پاڵدانەوە

هەموو دەعوا و حەقیقەتێکی مەزن بە دامەزراوی و ڕاستگۆیی شوێنکەوتوو و نمایندەکانی و، بە هەوڵدانیان لەپێناو پاراستنیدا، بەردەوامی بەدەستدەهێنێت و ناسنامەیەکی جیهانی وەردەگرێت. دەنا ئەگەر ئەم دەعوایە لەبەرامبەر هێرش و دەستدرێژیی بەردەوامی دوژمنەکانیەوە، بێبەش بێت لە دڵسۆزی خاوەن ئیدراک و ڕاستگۆیی و وەفا، زوو یان درەنگ مەحکومە بەوەی بڕووخێت و لە یادەوەرییەکاندا بسڕێتەوە.



هەروەك چۆن ئاوی وەستاو و خامۆش بۆگەن دەبێت، ئەو تەمبەڵانەش کە خۆیان لە باوەشی پاڵدانەوە هاویشتووە بەبێگومانی دەڕزێن و لەناودەچن. ئارەزووی پاڵدانەوە لە مرۆڤدا یەکەم نیشانە و زەنگی مردنە. بەڵام ئەگەر کەسێك هەستەکانی ئیفلیج بووبن، نە گوێی لەم زەنگە دەبێت و، نە هیچیش لەم نیشانەیە تێدەگات. بێگومان لە ئاگادارکردنەوەی دۆستانیش...



تەمبەڵی و لاشپەرستی یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی هەموو جۆرەکانی سەرشۆڕی و بێبەشبوون. ئەو ڕۆحە مردووانەی کە خۆیان لە باوەشی پشوودان و پاڵدانەوە دەهاوێن، بێ هیچ گومانێك ڕۆژێك دێت دووچاری سەرشۆڕییەکی وەها دەبن کە چاوەڕێ دەکەن تەنانەت پێویستترین پێداویستییەکانیشیان لەلایەن کەسانی ترەوە جێبەجێبکرێت.



کاتێك خانەپەرستیی زیادەڕەوکارانەش دێتە سەر حەزکردن بە پاڵدانەوە و پشوودان، ئیدی بێگومان مرۆڤ هێڵی هەوڵدان و ڕووبەڕووبوونەوە جێدەهێڵێت و لەسەر ئاستی ڕۆح دەمرێت. بەتایبەت ئەگەر ئەم نزمبوونەوەیە هەستی پێنەکرێت و بە ئازایەتی و پیاوەتی دابنرێت، ئەوە دەبێت بە کارەسات و ئابڕووچوونێکی تەواوەتی.



لەسایەی عەشقی هەوڵدان و حەزی کارکردندا، ئیمپراتۆرییەتێك لە عەشیرەتێکی بچووکەوە لەدایکبووە. ئەو ڕۆژەش کە ئارەزووی حەرەم جێگای

ئەم عەشق و حەزەی گرتەوە، میللەتێکی گەورە و گران لەگەڵ زەویدا تەخت بووە.

***

ئەوانەی لەپێناو عەشقی حەرەم و خانەپەرستیدا شوێنی پاسەوانیی خۆیان جێهێشتووە، زۆرجار بەپێچەوانەی مەبەستەکەی خۆیانەوە زللەیان خواردووە و، لە خانەی گەرموگوڕی منداڵی نازدار و شیرینی خۆیان بوون.

***

گۆڕانی مرۆڤ و ڕزینی، هێواش هێواش و بەوپەڕی بەبێدەنگی ڕوودەدات. تەنانەت جاری وەهایە غەفلەتێکی بچووك و جیابوونەوەیەکی کەم لە قافڵە دەبێت بە هۆکاری تیاچوون. بەڵام لەبەرئەوەی ئەم جۆرە کەسانە وادەزانن هەمیشە لە هەمان ڕێگە و لەسەر هەمان هێڵ بوون، زۆرجار هەست بەوەش ناکەن کە لە لوتکەی منارەیەکەوە بۆ بنکی بیرێك بەربوونەتەوە!

***

ئەوانەی هێڵ و سەنگەر جێدەهێڵن، هاوڕێ لەگەڵ حاڵەتی دەروونیی هەستکردن بە تاواندا کە شتێکی سروشتییە لە هەموو هەڵهاتوویەکی سەنگەردا، چونکە هەوڵدەدەن بەرگری لە خۆیان بکەن و ڕەخنە لە هاوسەرنگەرەکانیان بگرن، ڕزگاربوونیان لەو لادانەی تێی کەوتوون و گەڕانەوەیان بۆ هێڵی پێشوویان نزیکە لە ئەستەمەوە. ئەوەتا حەزرەتی ئادەم دوای ئەوەی تاچی خلیسکا، لەسایەی دانبنان بە کەموکورتییەکەیدا، بە جووڵەیەك بەرزبووەوە بۆ ڕێگەکەی خۆی. لەبەرامبەردا ئیبلیس سەرەڕای هەڵە گەورەکەی دەستی

کرد بە بەرگریکردن لە نەفسی خۆی و لە ئەنجامیشدا تووشی تیاچوونی ھەمیشەیی بوو...



ھەندێك جار ئەو کەسانەی عەزم و ئیرادە و شعووریان ئیفلیج بووە، کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر بوێری و ھێزی مەعنەویی کەسەکانی چواردەوەریان دەبێت. تەنانەت جاری وایە دووردڵییەکی بچووك و چوونە دواوەیەکی کەمی ئەم بێئیرادانە، بەئەندازەی مردنی ڕاستەقینەی سەد کەس، دەبێت بە ھۆکاری لەرزین و نائومێدی. حاڵەتێکی لەم جۆرەش تەنھا بە کەڵکی ئەوە دێت کە نازایەتی بە دوژمنانی میللەت و وڵات ببەخشێت و، ئارەزووی دەستدرێژیکردنیان ببزوێنێت.



جوانییە سەرنجڕاکێشەکانی دونیا و ماڵ و منداڵ، فیتنە و تاقیکردنەوەن، قوتابییە سەرکەوتووەکانی ئەم تاقیکردنەوەیەش ئەو بەختەوەرە خاوەن عەزم و ئیرادانەن کە بەیانی و ئیوارە عەھد و پەیمانی خۆیان لەگەڵ دەعواکەیاندا تازەدەکەنەوە.

# حەزی پلەوپایە

ھەروەك چۆن ناوك و تۆوی زۆرێك لە شتە باشەکان لە مرۆڤدا بوونی ھەیە، بەھەمان جۆر و لەپێناو ھەندێك حیکمەتدا بناغەی شتە خراپەکانیش لە مرۆڤدا ھەن. بۆ نموونە، لەپاڵ سیفەتە باشەکانی وەك ھەمیمییەت و

دڵسۆزی و خەمخۆری و پێنیازیدا، لە زۆر کەسیشدا سیفەتە خراپەکانی وەك خۆشویستنی پلەوپایە و، حەزکردن بە پێگە و پۆست و، نارەزووی دەرکەوتن، کە دڵ دەکوژن و ڕۆح ئیفلیج دەکەن، بوونیان هەیە. لەم ڕووەوە پێویستە لە پەیوەندییەکانمان لەگەڵ خەڵکیدا ئەم لایەنە سروشتییانەی مرۆڤ لەبەرچاو بگرین، بۆ ئەوەی تووشی خەیاڵشکان و نائومێدی نەبین.



هەریەك لە نارەزووی پلەوپایە و حەزکردن بە ناوبانگ و شۆرەت کە کەم تا زۆر لە هەموو کەسێکدا هەیە، ئەگەر بەشێوەیەکی مەشروع تێرنەکرێت، ئەوانەی نەیانتوانیوە خۆیان لەم بیر و هەستە ڕزگاربکەن، لەوانەیە زیانێکی زۆر هەم لە خۆیان و هەم لە کۆمەڵگەکەیان بدەن. هەروەك چۆن ئەگەر ڕێگری بکرێت لە خاڵیبوونەوەی شتێك کە لە لێواری پڕبووندایە دەبێت بە هۆکاری تێکچوون و ناڕێکی، بەهەمان جۆر ئەو ڕۆحە دەربەدەرانەی کە دڵیان بە شان و شۆرەت دۆڕاندووە گەر نارەزووە ناوەکییەکانیان بەباشی ئاڕاستە نەکرێن، کاولکارییەکی زۆر دەنێنەوە.



جووڵە و هەڵسوکەوتی ئەم ڕۆحە ناکامڵانە هەرچەندە تا ئەندازەیەك گورز لە ڕۆحیش بوەشێنێت بەناڕاستەی تێرکردنی نەفسیان کە شەڕی هەندەکێن، لەڕووی دەرەنجامەوە ڕێگری لە هەندێك شەڕ دەکەن و دەبن بە هۆکاری هەندێك باشەی هەندەکی. ئەمەش وا لەو ڕەفتارانە دەکات کە بە "سوکترین شەڕ" (اهون الشر) ئەژماربکرێن. بەڵێ، هونەرمەندێکی دەنگخۆش کە بەدوای "مافی چێژوەرگرتن"دا دەگەڕێت بۆ قورگی، ئەگەر لەبری هەڵڕشتنی تۆز و دوکەڵی گۆرانییە بەدڕەوشتەکان، لە ڕێگەی ئەغمەیەکی ئیلاهی و،

تەسبیحێکی زیندوو و، هۆنراوەیەکی مەولودەوە خۆیان خاڵی بکەنەوە، زمانی کەمترە و تەنانەت سەبارەت بە هەندێك کەس لەوانەیە خێرداتر بێت.



سەمیمییەت و ئیخلاص ڕۆحی ئەو کارانەیە کە دەکرێن و سیفەتی بکەرەکەیانە. لەم ڕووەوە بۆ ئەوەی کردەوەیەك لە کردەوەکان لای خوای گەورە قبووڵکراو بێت، پێویستە لە دڵەوە کرابێت و بکەرەکەی نییەتی هیچ جۆرە پاداشت و بەرامبەرێکی نەبێت و جگە لە ڕەزامەندیی خوای گەورە هیچ شتێکی تر تێکەڵ بە دڵی نەبێت. ئەوەندە هەیە سەرکەوتنێکی لەم جۆرەی هەموو کەسێك لە خزمەتکردندا، شتێکی زۆر قورسە. بەرمەبنای ئەمە، پێویستە حوکم سەبارەت بەم کەسانە لەسەر بناغەی ئەوە بدرێت کە داخۆ لەو کەسەدا خێر یان شەڕ باڵادەستە. بەڵێ، کاروباری وەها هەن کە لایەنی خۆدەرخستن و خۆبادان تیایاندا قورسە، بەڵام کەس ناتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە بەشێوەیەکی وەها سەبارەت بە مرۆڤی ئێمە و ئامانجە باڵاکانمان و بیرە موقەددەسەکانمان زیانبەخشن. ئەم جۆرە کەسانە لەوانەیە ئارەزووی شەخسی و خواستەکانی خۆیان تێکەڵ بە کارەکانیان بکەن و، هەموو کاتێك بیر لە ڕەزامەندیی خوا نەکەنەوە و، لەهەمبەر هەڵەکانیانەوە قەدیان نەچەمێتەوە و نەناڵێنن، بەڵام هەرگیز ڕاست نییە کە بوترێت لە بیروباوەڕ و ئاڕاستەیاندا، لەگەڵ حەقدا نین.



سەرەڕای هەموو ئەمانە، هەر تاکێك کە لەناو کۆمەڵێکدا خزمەت دەکات ئەگەر ڕاستەوخۆ و سەربەخۆیانە هەستێت بە نوێنەرایەتیکردنی ئەو بوارەی خزمەتی تێدا دەکات و، پاشان کەسانی تریش بە چاولێکردن لەمان ئارەزووی

دەرکەوتن بدات لەسەریان، دیسیپلینی کۆمەڵ تێکدەچێت و، هەموو شتێك ژێراوژوور دەبێتەوە و بەخێرایی هەنگاو بەرەو ئاژاوە و پشێوی دەنرێت. دواتر لەناو هەموو چینەکانی کۆمەڵگادا جووڵانەوەی تاك تاك کە لەلایەن خۆپەرستیی تاکەکانەوە پاڵدەنرێن دەردەکەون و، هەموو شتێك تێکەڵ بە یەك دەبن و، دەسەڵاتی مەرکەزی بەتەواوەتی لەناودەچێت.

* * *

ئەگەر سیما سەرکەوتووەکانی ناو حکومەتێك و، لایەنە چالاکەکانی ناو دەوڵەتێك و، ڕۆحە دینامیك و کاریگەرەکانی ناو دامەزراوەیەك، بەگوێرەی توانا و لێهاتنی شەخسی و سەرکەوتنەکانیان داوای پشکی شێر بکەن، ئەو حکومەتە ئیفلیج دەبێت و، ئەو دەوڵەتە دەڕووخێت و، ئەو دامەزراوەیەش دەگۆڕێت بە دێزنکی سەیروسەمەرەی وەها کە سەد دەم و زمانی هەیە. حکومەت بە یاسا و دەستوورەکانیەوە حکومەتە و، دەوڵەت بە بناغە و پرەنسیپەکانیەوە دەوڵەتە و، سوپاش بە ڕێز و گوێڕایەڵیی نێوان ئەرکانەکانیەوە سوپایە. بانگەشەکردن بۆ پێچەوانەی ئەمە، چاونووقاندنە لەناست ئەو ماکە گرنگانەدا کە دەرتێنن و ئەمڕۆش گەرەنتی بوون و مانەوەمانن.

* * *

خۆزگە دڵان بەو شتانەی بەدیهێنەری مەزن بەخشیونی و لە داهاتووشدا دەیانبەخشێت قەناعەتیان بکردایە و، لە هەموو جێیەکدا بەدوای ڕەزامەندیی ئەودا بگەڕانایە! بەڵام وا دەردەکەوێت هەندێك لەو خۆپەرستانەی کە قەناعەت بە ڕووناکی چرا کزەکەی خۆیان دەکەن و پشت لە تیشکەکانی خۆر دەکەن، هەتا ماوەیەکی دیکەش نەتوانن ڕوانینە کز و لێڵەکانی خۆیان ڕێکبخەنەوە و دەرگای ڕووناکی نەدۆزنەوە!

## گوڕوتینی لەدەستدراو

هەموو سەرکەوتنێک دەرئەنجامی گوڕوتین و ڕەنجکێشان و هەوڵدانی پێشووترە و، لە ڕوویەکیشەوە هۆکار و سەرەتای سەرکەوتنی دواترە. بەڵام نموونە هەیە پێویستە ئەوانەی بە ئامانج گەیشتوون هاوڕێ لەگەڵ مەستیی سەرکەوتندا، خۆیان بۆ باوەشی پاڵدانەوە نەهاوێن!

## تێکچوونی پێوەرەکان

لە دوێنێوە تا ئەمڕۆ سەرجەم خراپە و خراپەکارییەکان بە پیشاندانی شتانی خراپتر و، وا لە میللەت کرا قبووڵیان بکات. تەنانەت بە ناوی "سووکترین شەڕ"ەوە (أهون الشر) چەپڵەی بۆ لێدرا. بەوێنەی ئەو پەندەی کە دەڵێت "ڕەحمەت لە کفندزی پێشوو"... قبووڵکردنی ئەم فیکرە ناپاکانەیە ئیدی لە هەر سیستەمێکی نەفرەتییەوە سەرچاوە بگرێت جیاوازییەکی نییە لە ڕاستییەکی ڕەها کە لە خودی خۆیدا ڕێژەییە جگە لە "بەڵێ" کردن بۆ نارەسەنبوون و بۆگەنبوونێکی بێکۆتایی شتێکی دی نییە.

# زیادەڕەوی و کورتڕەوی

دەگونجێت لە هەموو فیکرێکدا زیادەڕەوی و کورتڕەوی ڕووبدات. هەردووکیشیان وەک ژەهری کوشندە وەهان. بەڵێ، هەروەک ئەوانەی لە جلوبەرگێکی شڕ و، پۆشاکێکی کۆن و، قابلەمەیەکی قوڕین و، ماڵێکی پیس و جاڵجاڵۆکەییدا بەدوای خاکیبوون و سادەییدا گەڕاون، خەڵەتاون، ئەوانەش کە لە شەپقەیەکی فەرەنسی و جلی بێیەخە و ملڕووتدا بۆی گەڕاون، بەهەمان جۆر خەڵەتاون.

# تەسەووری دەشتەکییانە

ئەگەر تەسەوورەکان بە ئاراستەی ئامانجێکی باڵادا ڕیز ببەستن و خەیاڵەکان پشتگیریی عەقڵ بەدەستبهێنن، مرۆڤ دەتوانێت بە فیکرە ڕووناکەکان و سەرکەوتنە یەک لەدوای یەکەکان بگات. بەپێچەوانەوە، خەیاڵاتە دەشتەکییەکان هیچ سوودێکیان نە بۆ جووڵانەوە زانستییەکان و نە بۆ دازرینەوەی ڕاستی نییە.

# گێژاوی خۆپەرستی

ئەمانەتی منێتی کە بە مرۆڤ دراوە، دیارییەکی پیرۆزە و لەپێناو دۆزینەوە و ناسینی گەورەترین ڕاستیدا پێی بەخشراوە، دیارییەك کە ڕاستەوخۆ دوای ئەوەی ئەرکی خۆی بەجێهێنا پێویستە بشکێنرێت. ئەگەر بەم جۆرە ڕەفتار نەکرێت، گەورە دەبێت و فووری تێدەچێت و، وەکو عیفرێتێکی لێدێت کە خاوەنەکەی هەڵدەلووشێت. مرۆڤ بەهۆی ئەوەوە لە بەدیهێنەری مەزن و ڕەهایی توانست و زانست و ویستەکەی تێدەگات و، پەی بەوە دەبات کە بەدیهێنەرەکەی ناتەواوی و کەموکورتی تووخنی ناکەون و، پاشان بە ئاگری ئەو مەعریفەت و خۆشەویستییەی کە لە سینەیدا تاوی داوە منێتیی خۆی دەتوێنێتەوە، تەنها بوونی بەدیهێنەری مەزنەوە دەڕوانێت و دەبینێت، بە ئەو بیردەکاتەوە و بە ئەو دەزانێت و تەنهاش بە ئەو هەناسەدەدات.



خۆپەرستی بە مانای نەناسینی خوا و، هەنگارنەنان بەناڕاستەی ئەبەدییەت و، نابینایی چاو و، سووڕانەوە لە جێگای خۆدا دێت. ئەوانەی هەمیشە بیر لە منێتیی خۆیان دەکەنەوە و، لە هەرێمی تاریکی "ئیگۆ"دا بەدوای هەموو شتێکدا دەگەڕێن، ئەگەر بەدرێژایی چەندین ساڵیش لە ڕاڕێشتندا بن، هێندەی دەرزییەك ڕێ نابڕن.



ئەو کارانەی دەکرێن، تەنانەت ئەگەر گرانترین و سەختترینیش بن، هەتا

لەپێناو منێتیدا ئەنجامبدرێن، نە فەزیلەت دەستی مرۆڤ دەخەن و نە لە دەرگانەی خواشدا قبووڵدەکرێن. ئەوانەی نەیانتوانیوە خۆیان تێپەڕێنن و، چەقۆ بکەن بەناو منێتی خۆیاندا و پارچە پارچەی بکەن و، بەسیرمێیان بەستراوە، هەموو هەوڵێك کە لەپێناو جیهانی غەیبدا دەیدەن خەڵەتان و خۆفریودانە و، هەموو فیداکارییەکیشیان بێعەقڵییەکە.

***

چونکە خۆپەرستی سیفەتێکی شەیتانانییە، نابێت گومان لەوە بکرێت کە خاوەنەکانی دووچاری هەمان چارەنووسی شەیتان دەکات. تەنانەت بەهانە و بەرگرییەکانی شەیتانیش، سەدا و زایەڵەی منێتی و خۆپەرستین. حەزرەتی ئادەم لەو کاتەدا کە ئاسۆی تاریك داهات، بە فرمێسکەکانی هەوری تەوار نوێی دروستکرد و هەوڵیدا بەهۆیانەوە ئاگری حەسرەت و ئاگری دەروونی بکوژێنێتەوە؛ بەڵام ئیبلیس بەدوای یەکدا بیانوو و بەهانەی ڕیزدەکرد کە هەموو وشەیەکی لەخۆباییبوون و سەرسەختی و، هەموو دەربڕینێکی بێڕێزی بوو...

***

منێتی چەندین جۆری هەیە؛ هەیە لە زانستەوە سەرچاوە دەگرێت، هەیە بە سەروەت و دەسەڵات دەردەکەوێت، هەشە بە زیرەکی و جوانی فووی تێدەچێت و گەورە دەبێت... لەبەرئەوەی هیچ یەکێك لەم سیفەتانە موڵکی زاتیی مرۆڤ نین، هەر بانگەشە و لافێك لەم ڕووەوە لێبدرێت، وەکو هۆکار و بانگهێشتنامە وایە بۆ ڕاکێشانی غەزەبی خاوەن موڵکی ڕاستەقینە و، بە لەناوچوونی ئەم ڕۆحە مەغرورانە کۆتایی دێت.

***

ئەو ئیگۆیەی کە دونیای ناوەوەی کەسێکی داگیرکردووە، ئەگەر منێتیی کۆمەڵیشی بچێتە پاڵ، بەتەواوەتی دەئاوسێت و عیفریتێکی دەستدرێژیکاری لێدەردەچێت. ئیدی لە دەستی ڕۆحێکی هاربووی لەم جۆرەدا تەنانەت خێردارترین شتەکانیش وەکو هەورێکی ڕەشیان لێدێت و، بۆمب و گوللە دەبارێنن. بەڵێ، لە دەستی کەسانی لەم شێوەیەدا زانست ڕووناکییەکی درۆیینە و، سەروەت ئامرازی خۆبادان و کەشوفش و، دڵ پێشەی مار و دووپشک و، جوانی لاپەڕەیەکی خەمە و بۆنی ناخۆش بڵاودەکاتەوە و، زیرەکیش حاڵەتێکی دزێوی وەک بە سووک سەیرکردنی خەڵکی وەردەگرێت.

لەوەتەی هەیە فەلسەفەی ماددەگەری نوێنەرایەتی منێتی و، پێغەمبەرایەتیش نمایەندەیی حەق و مەحرییەتی کردووە. لە ڕێگای ئەوانەی یەکەمدا گومان و دوودڵی و خەڵەتاندن و تۆقاندن و توندوتیژی، بەوێنەی بەیەکداکێشانی ترسناکی شاخە سەهۆڵینەکان بەر یەک کەوتوون و هەڕەوون بە هەڕەوون بوون. بەڵام لە ڕێگەی دووەمەدا ڕووناکی و ئاسوودەیی دڵ و یارمەتیدانی یەکتر و هاریکاری بوونیان هەبووە.



حاڵەتی دەروونیی باسکردنی خود لە هەموو شوێن و دەرفەتێکدا، نیشانەی کەموکورتی و هەستکردنی خاوەنەکەیەتی بە کەمی و نزمی. هەتا ئەو ڕۆژەش کە هاوڕێ لەگەڵ پەروەردەکردنێکی باشی ڕۆحدا هەموو ئەو شتانەی هەیانە دەیکەن بە فیدای خاوەنی موڵکی ڕاستەقینە، ئەم حاڵەتە بەم جۆرە بەردەوام دەبێت. هەموو کاروبارێکی ئەم جۆرە کەسانە کەشوفشێکە و، هەموو گوزارشتێکیان تەقەتەقی منێتییە و، هەموو خۆبەکەمزانینێکیشیان

یان ڕوونماییە یاخود وەبەرهێنانە لەپێناو باسکرانیان لەلایەن خەڵکییەوە. هەزار نەفرەت لە خۆپەرستانی حەقنەناس!

***

خۆپەرست هەروەك دۆستی ڕاستەقینەی نییە، ئاسوودەیی ویژدانیشی نییە.

# لە ڕێگای ئەبەدییەتدا

بەدیهێنەری مەزن بوونی هۆکاری بوونمانە و، مەزنێتییەکەی دەورانەوەری گەردوونی داوە و، ڕووناکییەکەی لە هەموو جێیەکدا نومایانە. ئاسمانەکان و زەوی بریسکەی درەوشانەوەی ئەون و، تێکڕای بوونیش بەندەی ئەڵقەلەگوێی ئەون. ئەو، میحرابی هەمیشەیی ئەو ڕۆحە کامڵانەیە کە بە حەقیقەت گەیشتوون. ئەو، تاکە مەوجودێکە کە عاریفەکان بە باڵی هەستەکانیان هەستی پێبکەن و بیناسن. وە ئەو قیبلەی تاقانەیە... وازهێنان لە ئەو و ڕاکردن بۆ لای شتانی تر شێتییە؛ خەم هەڵڕشتن بۆ کەسانی دیکەی جگە لە ئەویش فریوخواردنە. ئەوانەی دەرگای ئەو جێدەهێڵن تووشی بەدبەختیی هەمیشەیی دەبن و لە ڕێدا جێدەمێنن؛ ئەو دڵانەش کە بە نووری ئەو ڕۆشن نابنەوە بەدوای سەرابدا ڕادەکەن و بێهوودە ماندوو دەبن. سەرتاپای گەردوون بە نووری ئەو ڕووناکدەبێتەوە و شێوەی کتێبێك دەگرێتەخۆ. کات، لەسایەی ئەفەسە ئەفسووناوییەکانی ڕێگای بەرەو ئەو چووندا لە گوێزەییبوون دەردەچێت و، مانا و نرخێك بەدەستدەهێنێت...

ئەوە ئەوە کە شتانی بەدیهێناوە و بە هەزار و یەك زمان خستوونیەتە گۆ. ئەگەر ئەو بەدینەهێنایە، هیچ شتێك لە خۆیەوە دروست نەدەبوو. ئەو ڕێکوپێکی پێ نەبەخشیایە، هیچ شتێك یاسا و ڕێسای نەدەبوو. بەهۆی عینایەتی ئەوەوە گەردوون وەك مرۆڤێك و، یاسا و ڕێساکانیش وەك زمانیان لێهات. هەموو شتێك باسی ئەو دەکات و بە جوانییەکانی ئەو سەرمەستن! ئەگەر بوون نەبێت بە ئاوێنەیەك بۆ ئەو، لەگەڵ ئاسنێکی ژەنگاویدا جیاوازی چییە؟! ئەگەر مرۆڤ باس لە ئەو نەکات ئایا ناوی ئادەمیزادی لێ دەنرێت؟! ئاخ ڕۆحە تاریکەکان، ئەو کەرانەی هاواری ویژدان نابیستن! هەتا کەی بە بازیچەکان خۆتان ژێر دەکەن و چاوتان لە ئاست ڕاستیدا دەنووقێنن؟!

لەبەرئەوەی مرۆڤ لە دونیایەکدا دێتە بوون کە چوار لای بە ماددە دەورەدراوە، سەرەتا باوەڕ بەو شتانە دەکات کە بە "ئەندامەکانی هەست" ئەزموونیان دەکات. پاشان بەهۆی ئەو مانایانەی کە ئەمانە دەیبەخشن، زنجیری ملی منیتی دەشکێنێت و، هەوڵدەدات حەقیقەتەکەی ناو ویژدانی ببینێت. بەڵام ئەوەندە هەیە ژمارەی ئەوانەی پێیان لەم زنجیرە باریکە دەگیرێت و بەدرێژایی تەمەنێك ناتوانن هەنگاوێك بەرەو پێشەوە بنێن، کەم نین. لەبەرئەوە پێویستە شتانی چواردەورمان وەك کتێبێك بخوێنرێنەوە و وەك کۆرسێك گوێیان لێبگیرێت. لە کاتی خوێندنەوە و بیستنیشدا، نابێت نووسەری کتێبەکە و بەڕێوەبەری سەمفۆنیاکە پشتگوێبخرێت. ئەگینا هەروەك چۆن ئەو بوودەڵەیەی کە بەبێ هەستکردن بە نەفەسەکانی حەقیقەت لە ویژدانیدا سەرتاپای گەردوون گەمراوە و لە بەڵگەکاندا نوقم بووە، هەروەك هەرگیز ناتوانێت ئەو بدۆزێتەوە و بە حزووری بگات. ئەو ڕۆحە بەدبەختانەش کە کە ناتوانن بەهۆی فەرموودە و کتێبە پیرۆزەکەی ئەوەوە پەردەکانی چاو و

گوێیان بدەڕێنن و، بەرەو حەقیقەتی ناو ویژدانیان بەرزببنەوە، توانای ناسینی ئەویان نابێت.

ئەی ئەو خوا خاوەن بەزەییەی کە بە بوونی خۆی بوونمان ڕۆشن دەکاتەوە و،چاومان پڕنوور دەکات و، لە تاریکاییەکانی نەفس ڕزگارمان دەکات! ئەگەر ئەو نوورە ئەزەلییەی تۆ نەبووایە کە گەردوون ڕووناك دەکاتەوە، ئێمە نەماندەتوانی بە ڕاستی و دروستی هیچ شتێك ببینین و، هیچ بڕیارێکی ڕاست و دروستمان بۆ نەدەدرا. ئێمە هەمووومان بە کۆمەکی تۆ بە بوون گەیشتین عینایەتی تۆ تاجی سەرمان بێت بەو شتانەی تۆ پێت ڕاگەیاندووین فێری ڕاستی بووین! ئەگەر لوتفت نەتواندایە بە دەرخستنی خۆت لە ئاسۆی ڕۆحەکانماندا، لەکوێوە دەمانتوانی تۆ بناسین و لەکوێوە بە دڵنیایی و ئاسوودەیی دەگەیشتین؟!

ئەوە تۆیت کە هەموو بوونەوەرێکت کردووە بە زمانێك و لەناو ئەم زمانانەشدا مرۆڤت کردووە بە بولبول یاخوا قەت کەم نەبن ئەوانەی باسی تۆ دەکەن! بەڵێ، بەم کارەت وات لە ئێمە کرد ئەو ئایەتانە بخوێنینەوە کە لە چوارلای جیهاندا داتناوە، سەرلەنوێ و جارێکی دی حەقیقەتە هەمیشەییەکەی ناو ویژدانی خۆمانت دایەوە بەگوێماندا! لەسایەی ئەمەدا هەست بە پەیوەندی نێوان بەدیهێنەر و بەدیهێنراو دەکەین و، بە فووارەکانی مەعریفەتی ناو دڵمان بەرەو تۆ بەرزدەبینەوە. وە دیسان لەسایەی ئەمەدا، لە داڵانە تاریکەکانی نەفس و، گێژاوی نادیاری هەستەکان ڕزگارمان دەبێت و پارێزراو دەبین. ئێمە بە ناسینی تۆ کاکڵەی زانستمان بەدەستهێنا و چاومان کرایەوە بە ڕووی ئەو جوانییانەدا کە لەسەر ڕۆحی بوونەوەران نەخشاندووتن. ئەگەر هەنووکە هەست بە حیکمەتی سەر سیمای بوونەوەران بکەین و، وەکو ئەغمە شیرینەکانی

زەمزەمەیەکی مۆسیقی گوێ لە هەموو دەنگێکی ناو سروشت بگرین، ئەم بەتەواوەتی لە تۆوەیە؛ ڕۆحیشمان قوربانی تۆ بێت!

لەم کتێبە ئاوازە و شکۆدارەدا کە لەبەردەممانداناوەڵات کردووە، تابلۆی جوانییە بێوێنەکانی خۆت نیشانداین و، بەمەش جۆشوخرۆشت بە دڵەکانمان دا. گرێی زمانمانت کردەوە و، شەرەفمەندت کردین بە پایەی بەداستانکردنی ئەم جوانییانەی کە تایبەتن بە تۆ. ئەگەر سەدان جار موتاڵای ئەم کتێبەی گەردوون بکەین کە پێشانگای جوانییە بێوێنەکەی تۆیە؛ چەندین جار گوێبیستی نەغمەکانی ناو سروشت ببین کە باسی تۆ دەکەن و، ئەم کتێب و ئەم نەغمانە چەندەها جار بخەینە پێشچاوی تەماشاکارە تاسەمەندەکانی تۆ. هێشتا لەم هەرێمە نوورانییە تێرناخۆین و، دیسان بەرەو بیستنی تۆ ڕادەکەین و، لە ڕێگای تۆدا وەك عاشقان هەمیشە لەبەر خۆمانەوە ناوی تۆ دەڵێینەوە.

ئەی ئەو سوڵتانەی دڵمان ئاشنا دەکات بە جوانییە شاراوەکانی وجودی خۆی! لە ڕابردووەوە تا ئێستا هەزاران جار باسی تۆیان کردووە، چەندین جار کاسەی کەوسەری یەك لەدوای یەك پێشکەش بەو دڵانە کران کە تینووی عەشقت بوون. لەپاڵ ئاوازی چەشنی سروەی بەهەشت ئەو ڕۆحە پاك و بێگەردانەدا کە چەشنی سروەی بەهەشتە و، بوون بە تۆز و غوباری ڕێگای تۆ، ئەم دەنگە لەرزۆك و، ئەم "ڕوباب"ە[1] شکاوە و، ئەم دەستە ناکارامەیە خۆ قسەیەکی بۆ وتن نییە! بەڵام لێبووردەیی فراوانی تۆ کە مافی قسەکردن بە هەموو شتێك دەبەخشێت و دەکەین بە پەردە بۆ ڕووی بێشەرمەمان و، لەنێو قسەی دەلالان و بەیانی ڕەوانی مەردی گوفتاری بەردەرگاکەتدا دەڵێین "ئەمەش نەغمەی شڕ و شکاوی ئێمەیە" و، داوای لێخۆشبوونت لێدەکەین.

---

[1]. ڕەبابە لە جۆرە سازێکی مۆسیقای کلاسیکی ڕۆژهەڵات.

ئەوەندە هەیە لەم بابەتەدا وتەی ڕاستەقینە تایبەتە بەوان. جارێکی تر دان بەمەدا دەنێین و، هەوڵ دەدەین لە گوفتارەکانی ئەواندا کە وەك قەڵبەزە وەهان سەرلەنوێ باسی تۆ بکەینەوە و بە زەریای بێسنووری مەعریفەتی تۆ بگەین.

هەتا ئێستا گوێمان لە هەندێك دەلاڵ ڕاگرتووە کە باسی تۆیان بۆ کردووین، گوێمان بۆ دەنگەکان هەڵخستووە و، چاومان لە هێما و نیشانەکان بڕیوە. هەنووکە هەریەکێك لەو دەلاقانەی کە بە ڕووی دڵماندا کراونەتەوە بە پەنجەرە قبووڵ دەکەین، دەمانەوێت لە ڕێگەی هێما و هێمابەخشە جۆراوجۆرەکانەوە پرسیاری تۆ لە هەموو شتێك بکەین و، لە گشت جێیەکدا بەدواتدا بگەڕێین و، بە ڕێگایەکی جیاواز بەرەو لای تۆ بەرزببینەوە.

بە نووری چاومان ڕۆشنبکەوە و دەرمانی دڵمان بکە! جارێکی تریش دەرفەتی باسکردنی زاتی خۆت بەو بەندانەی بەردەرگاکەت ببەخشەوە کە بە هانای بەجێماوانی ڕێگاوە دەچن و، بەمەش ئەو بەندانەی بەر دەرکت کە بەندایەتی تۆ بەرپەڕی ئازادی دەبینن بە بەختەوەریی هەمیشەیی بگەیەنە. لە زاتی تۆ مەزنی و، لەوانیش دەلاڵی دەوەشێتەوە...

## دوعا

دوعا خۆراکی ڕۆحە، پێویستە بەبێ بچڕان پێی بدرێت.

***

دوعا ئەفسوونێکە باڵ بە ئیرادە دەبەخشێت، کەسی دیکەی ێجگە لەوانەی کە لەسەری بەردەوام دەبن، لەم هێزە نهێنییەی تێناگەن.

***

دوعا هۆکار و ئامرازەکان تێدەپەڕێنێت و، هەم هانابردنە بۆ قودرەتی خوایی و هەم ڕاگەیاندنی لاوازییەکانی مرۆڤە.

***

ترسناکترین ڤایرۆس کە تووشی دوعا دەبێت، بریتییە لە پێدانی کاریگەریی ڕاستەقینە بە هۆکارەکان. ئەو ڕۆحەی ئەم ڤایرۆسەی گرتبێت، چارەسەری زیاتری دەوێت.

***

جوانترین دوعا بەرامبەر بە تەنگانە و ناڕەحەتییەکان، ئەو دوعایانەن کە لە کاتی خۆشی و ئاسوودەییدا کراون.

***

خوایە گیان، متمانە و بڕوای من بە خۆت و بە دوعا زیاد بکە، واش لە ویژدانم بکە کە وەك ئەرکێکی ئەستۆی، ڕەچاوی هۆکارەکان بکات!

***

خوایە گیان، نە حالم بەرگەی عەزابت دەگرێت و، نە توانای مەحرووم‌بوونیشم هەیە لە ڕەحمەتت...

***

خوایە گیان، ئەگەر بێوەفایی بنوێنم و لە تۆش دوور بکەومەوە، حالم هاوارەکات کە بێ تۆ هەڵناکەم.. هەرچەندە بێوەفام، بەڵام موحتاجیم تالبی لوتفی تۆیە!

# پێوەر یان ڕووناکییەکانی ڕێگا

محمد فەتحوڵلا گولەن

مامۆستا محمد فەتحوڵلا گولەن خاوەنی وردەکارییەکی ناوازە و تایبەتە لە دەربڕینی بۆچوونەکانیدا و ئەم شاکارەش —کە دەکرێت بە یەکێك لە گرنگترین دەلاقەکانی سەر ئاسۆی دونیابینیی ئەو دابنرێت— لە بەرجەستەترین نموونەکانی ئەو وردەکارییەیە. کتێبی "پێوەر یان ڕوناکییەکانی ڕێگا" وەك ڕێبەرێکە کە نووسەر لە پاشخانی هزری ڕەسەنی جیهانی بیرمانەوە و لە گۆشەنیگا سەردەمییانە تایبەتەکەی خۆیەوە دەیداتە دەست ڕێبوارانی ڕێی گەیشتن بە کەماڵ و خزمەتی مرۆڤایەتی، تا لەسەررویەندی ئەم گەشتە بەرەو ئەبەد درێژبووەوەدا زامنی دروست هەنگاونان بێنت و، پارێزەری لە شاڕێ لادان... تێیدا ڕۆشنایی دەخاتە سەر ئەو ئاماژانەی ڕێگا کە بۆ گەیشتن بە ئامانج پێویستە بەگوێرەیان هەنگاو هەڵبگرین و، پێوەری مامەڵەیەکی دروست و سەرکەوتووشمان لەگەڵ گرنگترین کایەکانی ژیاندا دەخاتە بەردەست تا بێ خزان و لادان بگەینە مەنزڵ.







نرخی ٥٠٠٠ دیناره